# ڕێبەری بنەماکارزانیی



# لە نەشتەرگەریدا

نووسینی
چارلز و. ڤان وەی
چارلز أ. بێرک

هێلکاریەکان
ف. دێنیس گیدینگر

وەرگێڕان و کورت کردنەوەی لە ئینگلیزیەوە بۆ کوردی
هوشیار أمین أحمد

هەولێر ٢٠٠١

# ڕێبەری بنەماکارزانی لە نەشتەرگەریدا

نوسینی
چارلز و. ڤان وەی
چارلز أ. بێرک

هێلکاریەکان
ف. دێنیس گیدینگز

وەرگێڕانو کورت کردنەوەی لە ئینگلیزیەوە بۆ کوردی
هوشیار أمین أحمد

هەولێر ۲۰۰۱

# ڕێبەری بنەما کارزانیی لەنەشتەرگەریدا

نوسینی:

چارلز و. ڤان وەی

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەنەشتەرگەریی

بەشی نەشتەرگەریی لەناوەندی زانستە تەندروستیەکانی

زانکۆی کۆلۆرادۆ لە دێنڤێر، کۆلۆرادۆ

چارلز أ. بێرک

پرۆفیسۆرو سەرۆک بەشی نەشتەرگەریی

زانکۆی ڤێرگەی پزیشکی نیڤادا

لاس فیگاس، نیڤادا

ڕوونکردنەوەی وێنەیی:

ف. دێنیس گیدینگز

وەرگێڕانی لەئینگلیزیەوە بۆ کوردی:

هوشیار أمین أحمەد

ماستەر لەزانستەکانی پەرستاریی

مامۆستای یاریدەدەر لەبەشی تەندروستی کۆمەڵ

پەیمانگەی تەکنیکی هەولێر

## پێشەکی
## دەربارەی کارزانیی نەشتەرگەریی و سەرپەرشتیاریی نەخۆش

زۆربەی قوتابیانی پزیشکی پەیرەوو پرۆگرامی کاری خۆیان بەدوو سەرە ووشە ناودەبەن کە بریتین لە زانیاری و کارامەیی. ئەم دوو وشەیە وەکو خۆشەویستی و ژن هێنانی سەرکەوتوانە لەیەکتر جیانابنەوە. بۆ نموونە لەوانەیە بووکە قوتابییەک لەگشت گرنگیەکانی سارێژ بوونی برین بگات، بەڵام ئەگەر هاتو نەتوانێ داوی دوورینەوەی برین بخاتە سەر برینەکە یاخود نەتوانێ گرێی بدات و تەنها زانیاریەکی هەبێت و کارامەنەبێت، ئەو زانیاری‌یە هیچ مانایەکی نابێت بۆ نەخۆشێکی تووش بوو بە برینێکی هەڵپچڕاو.

بێگومان هەموو جارێ نەخۆش چاوەڕێی پزیشکێکی پسپۆڕی نەشتەرگەریی ناکات بۆ ئەوەی بۆڕیەکی هەناسەی لەقوڕگدا بۆ چەسپ بکات یاخود کانیولایەکی بۆ بخاتە ناو خوێنهێنەرەوە یان لەرزاندنی دڵی بۆ ئەنجام بدات. بۆیە گشت ئەو کەسانەی کە لەپیشەی سەرپەشتیاریی نەخۆشدا کاردەکەن، پێویستە لەم تەکنیکە بنچینەییانەدا شارەزابن.

نوسەرانی ئەم نامیلکەیە خاوەن ئەزمونێکی دەوڵەمەندن لەفێرکردنی قوتابیانی پزیشکی و ئەو کەسانەی کە لەبواری پزیشکی‌دا کاردەکەن. بەگوێرەی زانیاریی و دەست ڕەنگینی پێشوویان، چەند هەنگاوێکی کارکردنیان هەڵبژاردوە کە بنەمای سەرپەرشتی کردنی نەخۆشن.

لەم نامیلکەیەدا، بەهۆی وێنەکێشانەوە ڕێنمایی‌یەکی زۆر ڕێک و پێکی کارەکان ڕوون کراوەتەوە. ئەمەش هانی قوتابیان دەدات کە لەدەستپێکردنی کارەکانیاندا باوەڕیان بەخۆیان هەبێت. ئەوەی ئەم باوەڕەش بەهێزتر دەکات ئەوەیە کە ئەم تەکنیکانە لەسەر کارکردنێکی چاپووکانەی پتەودا بنیات کراون.


**ر. د لیشتی**
**دبلۆمی پزیشکی**
**پرۆفیسۆری نەشتەرگەریی**
**ناوەندی پزیشکیی زانکۆی کۆلۆرادۆ**
**دێنڤێر، کۆلۆرادۆ**

# پێشەکی وەرگێڕ

وەکو مامۆستایەکی یاریدەدەر لەبواری پەرستاری و زانیاریە تەندروستیەکاندا، زۆر بە پێویستم زانی کە ئەم نامیلکەیە پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکەم.

ئەم نامیلکەیە بریتیە لەزادەی زانیاری و کارزانی و کارامەیی دوو پزیشک کە هەندێ بابەتیان هەڵبژاردوە بەجۆرێک رۆژانە لە نەخۆشخانەو بنکە تەندروستیەکاندا پزیشکان و پەرستاران پێیان هەڵدەستن و بریتین لەبنەماکارەکانی سەرپەرشتی کردنی نەخۆش.

هەرچەندە گەلێ درەنگە بۆ ئێمەی کورد بەڵام کاتی ئەوە هاتوە کە فێربونی کاری تەکنیکی بەزمانی خۆمان بێت. بەتایبەتی ئەوانەی کە لەزمانی ئینگلیزی ناگەن. ئەگەرچی بەشێکی زۆری ئەوکارە پزیشکیانەی کە لەم نامیلکەیەدا باس کراون تەنها لەلایەن پزیشکانەوە ئەنجام دەدرێن، بەڵام پزیشکان هەردەم پێویستیان بەیاریدەدانی خاوەن پیشەی پەرستاری و سرکردن دەبێت. بۆیە ئەم بیرۆکەیە بوو کەهانی دام ئەم پەڕاوە وەرگێڕم بۆ زمانی کوردی. بێجگە لەوەرگێڕان، ئەم پەڕاوە کورت کراوەتەوەو لەهەندێ شوێندا ڕاڤە کردنم بەشێوەی ژمارەکردنی خاڵەکان داڕشتوە. ئەمەش ڕێگایەکی سەرکەوتوانەیە بۆ پتەوکردنی هێزی بیرهێنانەوە.

هەوڵێکی زۆرم داوە کە خوێنەران بەزمانێکی کوردی کووت و ئاسان لەم نامیلکەیە بگەن. بەڵام ئەگەر هاتو کەسێک ووشەیەک یاخود فینۆمینایەک لەجیاتی زاراوەیەکی دیاری کراو پەسەند بکات، ئەمە دەوڵەمەندیی زمانی کوردی دەسەلمێنێت. تەواویی و پاکیی تەنها بۆ خوای گەورەی زاناو بەتوانایە.

**هوشیار أمین أحمد**

**ماستەر لەزانستەکانی بەرستاریی**

**مامۆستای یاریدەدەر لەبەشی تەندروستی کۆمەڵ**

**پەیمانگەی تەکنیکی هەولێر**

# تەکنیکی پاگژ کردنەوە

## Aseptic Technique

لەماوەی (١٠٠) سەد ساڵەکانی ئەم دووایییەدا، کاری پزیشکی زۆر پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە. لەهەموویان گرنگتر بریتیە لە مامەلە کردن لەگەڵ جەستەی مرۆڤ بێ ئەوەی بیێتە هۆی هەوکردن. ئەم توانایەش گەلێ جۆرە تەکنیکی کارکردن دابین دەکات هەروەک چارەسەرکردن بەرێگای خوێنهێنەرەوە، گەلێ جۆرە رێگا بۆ ناسینەوەی نەخۆشی، دەرمان لێدان بەرێگای شریقەوە، بایەخ دان بە برین و نەشتەرگەریی. بنەمای ئەو توانایەش بریتیە لە کۆمەڵە تەکنیکێک کە بەشێوەیەکی گشتیی پێیان دەگوترێ تەکنیکی پاگژکردنەوە Aseptic Technique یاخود بێ میکرۆب کردن Sterile Technique .

گەلێ جار ئەم دوو زاراوەیە لەبریتی یەکتر بەکاردەهێنرێن. تەکنیکی پاگژکردنەوە بریتیە لە نەهێلانی تەواوی ووردەزیندەوەران هەروەک بەکارهێنانی گەرمی ئامێری ئۆتۆکلێڤ بۆ کوشتنی میکرۆب. بێ میکرۆب کردنیش هەمان مانا دەگرێتەوە و بریتیە لە نەهێلانی ووردەزیندەوەرەکان بەڵام لەوانەیە مادەی کیمیاوی بەکاربهێنرێت بۆ ئەو مەبەستە. هەروەک بەکارهێنانی مادەی کیمیاوی بەمەبەستی ئامادەکردنی پێست بۆ نەشتەرگەری. لەسەرەتادا مادەی ترشی کاربۆلیک (فینۆل) بەکاردەهێنرا بۆ بێ میکرۆب کردنی ئامێرەکان یاخود پێست. ئەمەش پێی دەگوترا تەکنیکی دژە پیسی Antiseptic Technique. بەڵام دوای داهێنانی ئۆتۆکلێڤی هەڵماوی و تەکنیکە فیزیاویەکانی دی کە کاریگەرتربوون لەمادە کیمیاویەکان لەرووی بێ میکرۆب کردنی ئامێرو قوماشی کەتان، زاراوەی تەکنیکی پاگژ کردنەوە بۆ جیاوازی کردن لەنێوان رێگا نوێیەکان و رێگا کیمیاویە کۆنەکاندا بەکارهێنرا. هەرچۆنێک بێت جیاوازی کردن لەنێوانیاندا نەما. وا باوە کە تەکنیکی پاگژکردنەوە بریتی بێت لەهەردوو رێگای کیمیاوی و فیزیاوی بۆ گەیشتن بە ئامانجی بێ میکرۆب کردن (sterility).

بۆ دوورکەوتنەوە لە هەوکردن، پێویستە مسۆگەری ئەوە بکرێت کە بەشێوەیەکی وا هەنگاوەکانی کارکردن لەسەر جەستەی نادەمیزاد ئەنجام بدرێت کە بەکتریا نەچێتە ناو جەستەوە. کەواتە نابێ رێگا بدرێ بەهەر وورده زیندەوەرێک کە بچێتە جەستەی نادەمیزادەوە، تەنانەت دەبێ ئەو ووردە زیندەوەرانەش قەدەغە بکرێن کە لەبنەرەتدا لەسەر پێستی کەسەکەدا هەبوون. دەبێ گشت ئامێرەکان، دەزووەکانی دوورینەوەی برین و شلەکان، بێ میکروب بکرێن. پێویستە دەستەکانی نەشتەرگەر لەبەکتریا پاک بکرێنەوە و بکرێنە نێو دەست کێشی لاستیکی، ئەگەر نا دەبێ هەنگاوەکانی کارکردنەکە وا ئەنجام بدرێن کە دەستەکانی نەشتەرگەرەکە بەر جەمسەرە بێ میکرۆب کراوەکانی ئامێرەکان نەکەون.

گرنگیەکانی بنەماکانی بایەخ دان بە پاگژکردنەوە لە نەشتەرگەری بچوکدا لەنەشتەرگەری گەورە کەمتر نین. تەنانەت ئەو پیسی‌یەی کە لەگەڵ برینی خوێنهێنەردا ڕوودەدات، هەر لەگەڵ چوونە ژوورەوەی میکرۆبی سەر مێزی نەشتەرگەریەکەدا، توانای کوشتنی نەخۆشەکەی هەیە.

## ئامادەکردنی پێست

بەشێوەیەکی سروشتی بەکتریا لەسەر پێستدا هەن. بۆیە پێویستە گشت پیسی سەر پێست پاک بکرێتەوەو پێست بێ میکرۆب بکرێ بەجۆرێک لەشلەی دژەپیسی **Antiseptic Solution** هەروەک ئایۆدین کە لەهەمویان کۆنترەو تا وەکو ئێستاش هەر بەکاردەهێنرێ. بەڵام هەرچەندە ئایۆدین باشترین دژەپیسی‌یە، کەچی کەمێک ژەهراوی‌یەو لەوانەیە پێستەکە بسووتێنێ. بۆیە ئەگەر ئایۆدین بەکاربهێنرێ، پێویستە یەکسەر ئەو ناوچەیەی پێست بەهۆی ئەلکهولەوە پاک بکرێتەوە.

ئایۆدۆفۆرەکان **Iodophors** بریتین لە کۆمەڵە پێکهاتوویەک لەئایۆدین و مۆلیکیولێکی ئۆرگانیکی و بەشێوەی ئەوجۆرە شلانەی کە ماددەی پاک کەرەوەیان تیادا هەیە بۆ شۆرینی دەست. یاخود مادەی پاک کەرەوەی تیانەبێ کە ئەمەش بۆ ئامادەکردنی پێست بەکاردەهێنرێت. ئایۆدینەکەش لەسەرەخۆ لەشێوە ئاڵۆزە ئۆرگانیکیەکەیدا سەرهەڵدەدا کە بەس بێ بۆ نەهێلانی سووتانی پێست بەڵام بەخێرایی بەکتریا دەکوژێ. لەژووری نەشتەرگەری دا بەشێوەیەکی ئاسایی لەسەرەتادا پیسی و چەوری پێست بەهۆی ماددەیەکی پاک کەرەوە لادەبردرێ. دوای وشک بوونەوەی پێست، شلەی بێ ماددەی پاک کەرەوەی دەخرێتە سەر لەگەڵ بەجێ هێشتنی چینێکی تەنک لەئایۆدۆفۆر لەسەر پێستەکەدا.

ئەلکهول بەشێوەیەکی بەرفراوان بەمەبەستی ئامادەکردنی پێست بۆ کون کردنی خوێنهێنەرو شریقە بەرێگای ماسولکەوە بەکاردەهێنرێت. هەرچەندە ئەلکهول پێست پاک دەکاتەوە بەڵام بەتەواوی بەکتریا ناکوژێت. کەچی ئایزۆپرۆپایل و ئەلکهول و ئیثانۆل هەردوکیان وەکویەک ناکاریگەرن.

جیوە دژەپیسێکی کاریگەرە. کلۆرایدی جیوە ژەهراویە بۆ پێست. کەچی مێربرۆمین (مێرکیورۆکرۆم) بەشێوەیەکی فراوان وەکو دژە پیس بەکاردەهێنرێ بەڵام کاریگەر نیە. بەڵام پێکهاتوەکانی جیوەی ئورگانیکی لەگشتیان کاریگەرترە هەروەک ثایمیرۆزال (مێرثایۆلێت) کە بەکارهێنانی گەلێ زۆرە. ئەم پێکهاتوانە ژەهراوی نین بەڵام بەکەمیەوە بەنێو پێستدا تێپەڕدەبن و گەشەی بەکتریا ڕادەگرن زیاتر لەوەی بکوژی بەکتریابن. سپۆرەکان ناکوژن و لەوانەیە ببنە هۆی حەساسیەتی پێست.

شلەی سابونی پاک کردنەوەی ئاسایی بەکتریا ناکوژێت بەڵام ئەگەر هاتو لەگەڵ مادەی هێکساکلۆرۆفین تێکەڵ کرابێ وەک دژە بەکتریایەکی کەمێ کاریگەر بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی ئەگەر هاتو ڕۆژانە سێ چوار جار بەکاربهێنرێ، ژمارەی بەکتریا لەسەر پێستدا

ئێجگار کەم دەبێتەوە. هەندێ جار هێکساکلوروفین بۆ شۆرینی دەست و قۆڵ بەر لە نەشتەرگەری بەکاردەهێنرێت.

(کلۆرهێکسین گلوکۆنێت) واتە (دیتۆل) کە پێکهاتوە کیمیاویەکەی بریتیە لە (Hexamethylene - bis - biguanide) لەناو (Isopropyl alcohol %4) لەگەڵ سابونی ئاسایی. ئەمەش بەکتریا کوژەو چالاکی‌یەکی دژە بەکتریای بەردەوامی هەیە. لەبەر ئەوەی (کلۆرهێکسیدین گلوکۆنێت) مادەیەکی ڕووشێنەر نیە بۆیە بەکارهێنانێکی باوی هەیە بۆ ئامادەکردنی دەست و شوێنی نەشتەرگەری.

هەندێ مادەی بۆندار هەن کە کاریگەریەکی چالاکیان هەیە بۆ سەر ڕووکەشی پێست لەهەمویان باوتر بریتیە لە بێنزالکۆنیەم کلۆراید (زێفیران). ئەو جۆرانە بەکتریا کوژن و تاڕادەیەک خێرا کاردەکەن بەلام کاریگەریان هێواشترە لە (ئایۆدین). کاریگەریان وەک مادەی پاک کەرەوەیەو بەنێو ڕووکەشی شانەکاندا تێبەڕ دەبن، بەلام بەهۆی سابونی ئاسایی و بریناو (Pus) وشلەی شانەکانەوە کاریگەریان کەمتر دەبێتەوە. هەروەها ئەم جۆرە بەکتریا کوژانە چینێک لەسەر پێستدا دروست دەکەن کە بەکتریا لەژێریەوە دەمینێتەوە. بەلام لەبەر ئەوەی تاڕادەیەک ڕێژەی بەژەهراوی کردنیان نزمە، بۆیە لەسەر شوێنی ناسک و حەساس بەکاردەهێنرێن هەروەک چاوو لینچەپەردەکان کە بەکارهێنانی (ئایۆدۆفۆر) بۆ ئەو شوێنانە ئازار بەخشە.

بنەمای ئاسایی لەئامادەکردنی شوێنی نەشتەرگەری دا بریتیە لە دەست پێ کردن لەناوەڕاستەوە ئنجا بەشێوەیەکی بازنەیی بۆ دەرەوە (وێنە 1-1).

**Fig. 1-1.** Skin preparation. The principle is to start at the center and move outward, in reverse concentric circles

ئەو تەکنیکەی سەرەوە برینی پیس ناگرێتەوە، بەڵکو لەبرینی پیس بوودا لەسەرەتادا پێستی دەوروبەری برینەکە ئامادە دەکرێ ئنجا برینەکە پاک دەکرێتەوە. کەچی لەگشت حاڵەتێکدا پێویستە ئەو ناوچەی کە بۆ نەشتەرگەری ئامادە دەکرێت گەلێک فراوانتر بێت لەناوچەی پێشنیارکراو بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە.

کاتی پێویست بۆ پێست ئامادەکردنێکی تەواو بریتیە لە(٥) پێنج خولەک. کاتێ کە

پێست بە ماددەیەکی پاک کەرەوەی پێکهاتو لە (ئایۆدۆفۆر) پاک دەکرێتەوە، ژمارەی جێماو لە بەکتریا بەشێوەیەکی تێبینی کراو لەیەکەم خولەکدا کەم دەبێتەوەو لەدووەم و سێیەم خولەکدا بەرەبەرە کەمتر دەبێتەوە ئنجا دوای (٥) پێنج خولەک دەبێتە کەمترین ژمارە. بەڵام لەهەندێ ژووری نەشتەرگەری دا (١٠) دە خولەک بەکاردەهێنرێ بۆ ئامادەکردنی پێست.

## ئامادەکردنی دەست

هەرچەندە دەستەکانی نەشتەرگەر بە دەستکێشی بێ میکرۆب داپۆشرابن کەچی دەبێ دەستەکانیان تاوەکو ناوچەی ئانیشک بەهۆی فرچەو سابونی تایبەتیەوە بەشێوەیەکی چاک بشۆرن. چونکە لەوانەیە دەستەکانیان بەکتریای نەخۆشکەریان هەڵگرتبێت کە سەرچاوەکەی نەخۆشێکی دی بێت. لەکاتی کارکردنیشدا هەندێ جار دەستکێشەکە کون دەبێت یاخود هەڵدەزرێت. تەنانەت بێ ئەوەی داپچڕێ، هەندێ جار کونی چاوەڕێ نەکراو لەدەستکێشەکەدا پەیدا دەبن.

بۆ مەبەستی ئەو جۆرە شۆرینە ماددەی (ئایۆدۆفۆر)، (هێکساکلۆرۆفین)، یاخود (کلۆرهێکسیدین گلوکۆنێت) لەگەڵ مادەی پاک کەرەوەدا تێکەڵاو دەکرێن وەکو پاک کەرەوەو لەهەمان کاتدا وەکو بەکتریا کوژ بەشێوەیەکی باو بەکاردەهێنرێن. هەندێ جاریش ئەو جۆرە ئیسفەنجانە بەکاردەهێنرێن کە یەکێ لەو ماددانەی سەرەوەیان پێوەیەو یەک جار بەکاردەهێنرێن و فڕێ دەدرێن. لەکاتێکدا کە (ئایۆدۆفۆر) و (کلۆرهێکسین) باشترین کاریگەریان هەیە لەبەکارهێنانی یەکجارەکیدا. ئەو جۆرە شلە پاک کەرەوەی کە (هێکساکلۆرۆفین)ی تیادایە، لەیەکەم جاری بەکارهێنانیدا، کاریگەریەکەی کەمێک زیاترە لەوەی کە مادە پاک کەرەوەکە بەتەنها بێت. هەرچۆنێک بێت (هێکساکلۆرۆفین) دوای (٢) تا (٤) ڕۆژ لەبەکارهێنانی بۆ چەند جارێکی بەردەوام، لەژێر پێستی دەستەکاندا کۆدەبێتەوەو ژمارەی بەکتریاکان بەڕێژەی ٥ ٪ یاخود کەمتر نزمتر دەبێتەوە لەوەی کە لەسەرەتادا هەبوونە. بۆیە بەکارهێنانی ئەو ماددەیە لەلایەن نەشتەرگەرەکانەوە زۆر باوەو بۆئەوەی کاریگەریەکەی زیاتر بێت، پێویستە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک و ڕۆژانە چەند جارێک بەکاربهێنرێ.

بۆئەوەی دەست شۆرینێکی پێوانەیی و چاک ئەنجام بدرێت، پێویستە یەکەم جار هەردوو دەستەکان بەشێوەیەکی میکانیکی بشورێن (وێنە 2-1). هەرچلکێک لەژێر نینۆکەکاندا بەچاو ببینرێن، دەبێ بەهێزی فرچە یان پارچە کانزا یاخود پلاستیکی تایبەت بۆ پاک کردنەوەی نینۆک چلکەکە لابدرێ. ئنجا بۆ ماوەی (٥) پێنج خولەک دەست تاوەکو ئانیشک بشورێ بەمەرجێک لەپەنجەکانی دەستەوە بۆ سەرەوەی دەست ئنجا باسک تاوەکو ئانیشک. هەرچەندە هەندێ جار (١٠) دە خولەک بەکاردەهێنرێ بەڵام (٥) پێنج خولەک بەسە بۆ ئەو مەبەستە.

**Fig. 1-2. A,** Scrubbing fingers. **B,** Scrubbing hands and arms to the elbows.

دوای ووشک کردنەوەی دەستەکان و لەدەست کردنی دەستکێش، بەشێوەیەکی ئاسایی دەستەکان ئارەق دەکەن. هەرچەندە بەکتریا لەدرزە قوولەکانەوە بەرەو ڕووکەشی پێست شۆراو کراون، کەچی ئەگەر هاتو شلەی پاک کەرەوەی (ئایۆدۆفۆر) بەکارهێنرابێ، دوای تێپەڕبوونی نزیکەی یەک کاتژمێر ژمارەی بەکتریاکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژمارەیەی پێشو کە هێشتا دەست نەشورابێ. لەهەمان کاتدا بڕیار لەسەر ئەوە نەدراوە کە کاریگەری شۆرینی دەست تا ئانیشک لەکاتی نێوان ئەنجامدانی دوو نەشتەرگەری دا پارێزراو بێت. بەڵام ئەگەر هاتو شلەی (هێکساکلۆرۆفین) وەکو نەریتێک بەکاربهێنرێ، بەشێوەیەکی بەردەوام ژمارەی بەکتریاکان بەنزمی دەمینێتەوە. لەکاتێکدا ئەگەر هاتو نەشتەرگەر بەشێوەیەکی ڕۆتینی (هێکساکلۆرۆفین) بەکاربهێنێ، دەتوانێ کاتی شۆرینی دەستەکانی لەنێوان نەخۆشێکەوە بۆ نەخۆشێکی دی لە (٥) پێنج خولەکەوە کەم بکاتەوە بۆ (٣) سێ خولەک.

هەرچەندە ئەو جۆرە شۆرینەی باسمان کرد بەشێوەیەکی سەرەتایی لەژووری نەشتەرگەری دا ئەنجام دەدرێت، بەڵام زۆربەی نەشتەرگەرییە بچوکەکانیش پێویست بەم شۆرینە دەکەن. کەچی هەندێ تەکنیکی وەکو بۆری سنگ (Chest tube) یان بایۆپسی جگەر پێویست بە دەست شۆرین ناکەن بەڵکو تەنها پێویست بە دەست کێش دەکەن.

# تەکنیکەکانی بێ میکرۆب کردن

## (Techniques of sterilization)

پێنج جۆرە تەکنیکی باو هەن بۆ بێ میکرۆب کردنی ئامێرو شلەکان کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- ئۆتۆکلێڤی هەڵماوی (Steam Autoclaving)

٢- گازی ئیثایلین ئۆکساید (Ethylene oxide)

٣- هەڵهێنجان لەناو شلەی میکرۆب کوژ (Soaking in Germicidal Solutions)

٤- تیشکاوی کردن (Irradiation)

٥- درزە پالاوتنی شلەکان (Millipore Filtration of Solutions)

ئۆتۆکلێڤی هەڵماوی بۆ ئامادەکردنی ئەو ئامێرانە بەکاردەهێنرێت کە بەشێوەی چەمک یان کۆمەڵن. بەکارهێنانی هەڵم لەژێر پاڵەپەستۆدا پلەی گەرمی بەرز دەکاتەوەو دەگاتە سەرووی پلەی کولانەوە. هەڵمەکە بۆیە گرنگە چونکە رێگای گەرمی دەدات بۆ ئەوەی بەنێو داپۆشەری چەمکی ئامێرەکانەوە تێبەڕ بێت. بەشێوەیەکی گشتی پلەی گەرمی نزیکەی (١٢٠) پلەی سەدی کە دەکاتە (٢٥٠) پلەی فەهرەنهایتی لەگەڵ پاڵەپەستۆی (٢٠) تا (٢٥) پاوەند بەکاردەهێنرێ بۆ ماوەی (١٥) تا (٣٠) خولەک. بۆ ئامێری کانزایی و دانەپۆشراو پێویستمان بە تەنها (١٥) خولەک دەبێت. کەچی چەمکێ قوماشی کەتانی داپۆشراو پێویست بە (٣٠) خولەک دەکات. پارچە شریتێک یاخود هەر نیشانەرێکی دی بەکاردەهێنرێ بەچەشنێک کە دوای گەیشتنی پلەی گەرمی ناو ئوتۆکلێڤەکە بەسنوری پێویست، رەنگی نیشانەرەکە دەگۆڕێ بۆ رەنگێکی نوێ. هەندێ جار ئەو جۆرە نیشانەرانە پەسەند ناکرێن، بۆ نمونە هەڵم ناچێتە نێوان شەویلگە داخراوەکانی گیرە (Clamp)یەکەوە. هەروەها هەڵم بەنێو نیدڵێکی تیرە باریکەوە تێناپەڕێ تەنها مەگەر بارچە تەلێکی باریک بخرێتە ناو نیدلەکەوە.

ئیثایلین ئۆکساید گازێکی میکرۆب کوژەو لەپلەیەکی گەرمیٚ نیمچە نزمدا لەنێوان (٥٠) تا (٦٠) پلەی سەدی واتە (١٢٠) تا (١٥٠) پلەی فەهرەنهایتی بۆ بێ میکرۆب کردن بەکاردەهێنرێ. بەزۆری بۆ ئەو ئامێرانە بەکاردەهێنرێ کە گەرمی زیانیان پێ دەبەخشێ. گازەکە ژەهراویەو دەبێ لەناو ئۆتۆکلێڤێکی تایبەت دروست کراو بەکاربهێنرێ. پێویستە ئامێرەکان بۆ ماوەی (٣) سێ کاتژمێر بدرێنە بەر ئەم گازە بۆ کوشتنی گشت بەکتریاو سپۆرەکان. هەروەها نیشانەری بێ میکرۆب کردن (Sterilization Indicaters) هەمان ئەوەی کە لە بێ میکرۆب کردنی هەڵماویدا باس کرا، بۆ بێ میکرۆب کردن بەگازی ئیثایلین ئۆکساید بەکاردەهێنرێ کەچی گەورەترین لایەنی خراپی ئەو گازە ئەوەیە کە بەنێو پلاستیک و لاستیکدا تێپەڕ دەبێت، بۆیە گشت ئامێرەکان لەپێش بەکارهێنانیدا بۆ ماوەی (٢٤) بیست و چوار کاتژمێر دەدرێنە بەر هەوا. کەچی ئەگەر هاتو پارچەی چاندراو بەم

ڕێگایە بێ میکرۆب بکرێن هەروەک زمانەی دەستکرد یاخود لوولە خوێنی گواستراوە، پێویستە دوای بێ میکرۆب کردن بۆ ماوەی (٥) پێنج تا (٧) حەوت ڕۆژ بدرێنە بەرهەوا ئنجا بەکاربهێنرێن.

ئەو جۆرە بێ میکرۆب کردنەی کە هەندێ جار پێی دەووترێ سارده بێ میکرۆب کردن (Cold sterilization) بریتییە لە دانانی ئامێرەکان لەناو شلەی (فۆرمالین) یاخود (ئایۆدۆفۆر) بەشێوەیەکی بەرفراوان لە بەکارهێنانی ڕۆژانەدا جێگای خۆی کردۆتەوە، هەروەک بێ میکرۆبکردنی تیانۆڕی میزڵدان (Cystoscope). ئەم ڕێگایە زۆر کاریگەرە کەچی دەبێ ئامێرەکە چاک بشورێتەوە بۆ ئەوەی شوێنەواری شلەی بێ میکرۆب کردنی پێوە نەمینێ.

زۆربەی کارگەکانی دروست کردنی ئامێرە پزیشکیە بێ میکرۆب کراوەکان و شلەکانی خوێنهێنەر (Intravenous fluids)، هێندێکی ڕادەبەرز لە تیشکی گاما (gamma) بۆ بێ میکرۆب کردنی بەرهەمەکانیان بەکاردەهێنن. بەشێوەیەکی ئاسایی سەرچاوەی ئەو تیشکە بریتیە لە توخمی (کۆبالت). ئەم ڕێگایە بۆ نزیکەی گشت بەرهەمەکان بەکاردەهێنرێ پێش ئەوەی لەپاکێتەکەیاندا بپێچرێنەوە. ئەمەش ڕێگایەکی گونجاوە بۆ مادە پلاستیکیەکان. چونکە بەهۆی گەرمی ئۆتۆکلێڤەوە تێک دەشکێن. لەراستیدا ڕێگای تیشک باشترین ڕێگای نموونەیی‌یە بەڵام پێویست بە سەرمایەی زۆر دەکات.

درزە پاڵاوتنی شلەکان (Millipore filtration) بەهێندی بچوک بچوک لە دەرمانخانەی نەخۆشخانەکاندا بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهێنرێ. لەم ڕێگایەدا شلە بەنێو پاڵێوەرێکی پێوانە (٠,٢٢) مایکرۆن تێپەڕ دەکرێ. ئەم پاڵێوەرە ڕێگای بەکتریاو سپۆرەکان نادات کە پیایدا بچنە خوارەوە.

## ناوچەی بێ میکرۆب

## The Sterile Field

بۆ ئەنجامدانی هەنگاوەکانی کاری نەشتەرگەریی، یەکەم هەنگاو بریتیە لە دامەزراندنی ناوچەیەکی بێ میکرۆب. بوخچەی پێداویستیەکانی نەشتەرگەری دەکرێتەوە (وێنە 2-1). دەبێ دەستەکانیش بشۆرێن هەتا وەکو ئانیشک ئنجا دەست کێش لەدەست دەکرێ و پێستی نەخۆشەکە بەهۆی گیرەیەکی بازنەیی‌یەوە (Ring Forceps) ئامادە دەکرێت یاخود بەهۆی گیرەیەکی گەورە کە پارچە ئیسفەنجێکی بێ میکرۆبی پێوە بێت (وێنە 1-1). ئەگەر پێویست بکات، خاولی یان پارچە قوماشی بێ میکرۆب لە دەوروبەری شوێنی نەشتەرگەریەکە ڕادەخرێن. ئەوکاتە بوخچەیەکی پێداویستی بێ میکرۆب لەسەر مێزەکەدا

هەیە لەگەڵ ناوچەیەکی نەشتەرگەری بێ میکرۆب کە دەورە دراوە بە چەند پارچە خاولیەکی بێ مـــیکرۆب (Sterile Towls) هەر شتێکی پێویست بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە پێویستە کەسێک بیانهێنێتە ناوچەی بێ میکرۆب کە ئەوکەسەش لە دەرەوەی ناوچەی بێ میکرۆب بێت. بۆ ئەو مەبەستەش بەلایەنی کەمەوە ئەم کارە بۆ زۆربەی جاران پێویست بە دووکەس دەکـات. یەکێکیـان دەست کێشی لەدەست بێت و لەناوچە بێ مـــیکرۆبەکـــەدا کـاربکات، دەستـەکـانی ئەوی دی بێ مـــیکرۆب نەکـــرابێ و پێداویستیەکانی نەشتەرگەری بگـوازێتـــەوە بـۆ نـاوچەی بێ میکرۆب. چونکە پێداویستـە بێ مـــیکرۆبەکـــان هەردەم ســـەریان داخـــراوە بۆ ئەوەی بەدەســـتی ئـاســـایی (بێ مـیکرۆبیش نەکـرابێ) لەرووی دەرەوە ســـەرپۆشـــەکـــانیـــان بکرێنەوە.

Fig. 1-3. Sterile table and sterile field.

# جلی نەشتەرگەری و سەرپۆش و دەمامک

## Gowns, Caps and Masks

بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی نەشتەرگەری، پێویستە سەرپۆشی نەشتەرگەری و دەمامک بپـۆشـرێن. ســەرپۆشـەکـە ناهێڵێ شـتی مـیکرۆباوی بکەوێتـە خـوارەوە بۆ ســەر نـاوچە بێ مـیکرۆبەکـە. قـژی درێژ پێـویست بە سەرپۆشـێکی قـەبارە گـەورەتر دەکـات. کـەچی ئەوەی ڕیشی هەبێ پێویستی بە چەشنێکی وەکو کلێتە دەبێت کە سەرپۆشەکەو دەمامکەکەی یەک پارچەبن. دەمـامـکیش شـێـوەو قـەبارەی هەمـەجـۆری هەیەو مـەبەست لەبەکـارهێنانـیـدا قەدەغەکردنی گەیشتنی پروشکی دەمی نەشـتەرگەرەکەیە بۆ ئەوەی نەکەوێتە سەر ناوچە بێ مـیکرۆب کـراوەکە. بەشـێوەیەکی گشـتی، سەرپۆش و دەمـامـک لەکـاغەز دروست دەکرێن و تەنها یەک جار بەکاردەهێنرێن.

جلی واته بەروانکەی نەشتەرگەری بۆ کارێکی نەشتەرگەری گەورە یاخود درێژخایەن لەبەردەکرێت، یاخود ئەگەر پێویست بەوەبکات کە ناوچەی باسک بخرێتە سەر ناوچە بێ میکرۆبەکە. شتێکی زەحمەتە کە برینێک بدوورێتەوەو داوەکە بەر ناوچەی باسک نەکەوێ. دەستێکت بەتەنها بۆ دوورینەوەی بچوکە هەڵپچڕانێک یاخود بۆ ئەنجامدانی هەڵزڕاندنێکی بچوک بەکاردەهێنرێ، بەڵام کارێکی وەکو قەستەرەی دڵ یاخود دوورینەوەی هەڵپچڕانێکی گەورە، پێویست بە جلی نەشتەرگەری دەکات. تەنها ئەو بەشانەی جلی نەشتەرگەری کە بە ئاسانی بەچاودەبینرێن، بە ناوچەی بێ میکرۆب لە قەلەم دەدرێن. ئەو بەشانەش بریتین لە هەردوو قۆڵەکان لەژێرەوەی پەلەکانی سەرەوەو پێشەوەی بەروانکە لەبەشی سەرەوەی کەمەردا. هەرچەندە لەسەرەتادا گشت بەشەکانی جلەکە بێ میکرۆبن (Sterile) بەڵام گرنگ نیە ئەگەر هاتو هەندێ بەشی جلەکە بەر شتی میکرۆباوی (Nonsterile object) بکەوێ، ئەو بەشانەش بریتین لە تەنیشتەکان و بەشی دواوەو هەردوشان و بەشی خوارەوەی جلەکە. تەکنیکی لەدەست کردنی دەست کێش کاتێ کە جلی نەشتەرگەریت لەبەردابێ، پێویست بە نەختێک لێزانی دەکات. لەسەرتاپای جیهانیشدا تەکنیکی داخراو (Closed technique) بەکاردەهێنرێت (وێنە 1-4). لەم تەکنیکەدا هەردوو دەستەکان دەخزێنە نێو هەردو قۆڵەکانی جلەکەوە. یەکێ لەدەست کێشەکان بەهۆی دەستێکی داپۆشراو هەڵدەگیرێ و لەسەر کۆتایی قۆڵەکەی دی دادەندرێ. ئنجا دەستەکەی دی دەخرێتە نێو دەست کێشەکەوە. دەست کێشەکەی دی بەهۆی دەستە دەست کێش لەبەرکراوەکەوە هەڵدەگیرێ و لەسەر کۆتایی قۆڵی یەکەمەوە دادەندرێ. ئنجا دەستی یەکەم دەخرێتە نێو دەست کێشەکەوە. راڤەکردنی ئەم تەکنیکە نەختێ شێوێنەرە بەڵام فێربوونی ئاسانەو لایەنە چاکەکەی ئەوەیە کە دەستی بێ دەست کێش بەر سەردەستی دەست کێشەکە ناکەوێ، ئەمەش رێگای ئەوە نادات کە جلەکەو دەست کێشەکە پیس بێن.

**Fig. 1-4. A,** Left hand with gown picking up glove. **B,** Left hand putting gown on right sleeve; right thumb grasping through gown.

**Fig. 1-4, cont'd. C,** Left hand (through gown) pulling right glove and sleeve over right hand. **D,** Right hand in glove, sleeve at wrist, and left hand still pulling down.

بەکورتی، تەکنیکی پاک کردنەوە **Aseptic technique** بریتیە لەجەستەی کۆمەڵە تەکنیکێک بۆ مسۆگەرکردنی ئەوەی کە هیچ جۆرە بەکتریایەک لەو ناوچە بێ میکرۆبەدا نەبێ کە نەشتەرگەری تیادا ئەنجام دەدرێت. هەرچەندە درێژەی تەکنیکەکە جیاوازی هەیە لەنێوان هەنگاوەکانی ئەنجامدانی کارێکی نەشتەرگەری بۆ کارێکی دی، بەڵام پێویستە تەکنیکە بنچینەییەکان لەگشت جۆرەکاندا رەچاو بکرێن.

# چەند جۆرە ئامێرێکی نەشتەرگەریی بچوک

نەشتەرگەرو پزیشکەکان بەدرێژایی مێژوو گەلێ جۆرە ئامێری نەشتەرگەریان داهێناوە یاخود بەگوێرەی پێویست گۆرانکاریان بەسەردا هێناوە. شارەزابوون لەشێوەو جۆرو بەکارهێنانی ئەم ئامێرانە، دەرگای کاری نەشتەرگەریی بچوک بۆ قوتابیانی پزیشکی و نەشتەرگەری دەخاتە سەرپشت.

بۆ ئەو مەبەستەش لەخوارەوەدا چەند ئامێرێکی وێنەکێشراو دەخەینە روو کە لە نەشتەرگەریی بچوک (**Minor Surgery**)دا بەکاردەهێنرێن.

**Fig. 2-1.** Scalpel handle with three most commonly used disposable scalpel blades.

**Fig. 2-2** Proper method for holding scalpel.

Fig. 2-3 MAYO SCISSORS

Fig. 2-4 METZENBAUM SCISSORS

Fig. 2-5 IRIS SCISSORS

Fig. 2-6. BANDAGE SCISSORS

Fig. 2-7. Right - handed use of scissors.

Fig. 2-8. Left - handed use of scissors.

Fig. 2-9. Pressure. relationships in right - handed use of ratchet lock forceps.

**Fig. 2-10.** Inverse pressure relationships in left-handed use of ratchet lock forceps.

**Fig. 2-11.** Types of thumb forceps: toothed for traction, Adson for atraumatc graspng, and smooth for stabilization.

Smooth forceps

Adson forceps

Toothed forceps

Allis forceps

Kocher forceps

**Fig. 2-12**

**Fig. 2-14** Mosquitos.

**Fig. 2-13** Hemostatic forceps.

**Fig. 2-15** Needle holder.

**Fig. 2-16** Towel clamps.

**Fig. 2-17** Smooth manual retractors.

Rake retractors

Skin hook

**Fig. 2-18**

**Fig. 2-19**

**Fig. 2-20** Frazier tip suction.

**Fig. 2-21.** Electrosurgical tools.

**Fig. 2-22.** Applying electrosurgical current.

# داوو دەرزی و دوورینەوەی برین

جۆرەکانی داوی دوورینەوەی برین ئەمانەن:

أ- **جۆری تواوە** «Absorbable» :

١- ڕیخۆڵەی ئاسایی « Plain gut» .

٢- ڕیخۆڵەی کرۆماوی «Chromic gut» .

٣- ترشی پۆلی گلایکۆلیک «Polyglycolic acid» .

٤- پۆلی گلاکتین «Polyglactin» .

٥- پۆلی دایاکسانۆن «Polydiaxanone» .

جۆری ڕیخۆڵەی ئاسایی پتەویەکەی ١-٢ هەفتە دەخایەنێ. ڕیخۆڵەی کرۆماوی ٢-٣ هەفتە. دوو جۆری یەکەم لەچینی پتەوی ژێر لینجە پەردەی ڕیخۆڵە دروست دەکرێن. بەزۆری ڕیخۆڵەی بەراز. جۆری سێیەم پتەویەکەی ٢-٣ هەفتەیەو بەڕێژەیەکی کەمتر لەدوانەکەی یەکەم دەبێتە هۆی هەوکردن «التهاب». پۆلی گلاکتین ژمارەی بازرگانی «٩١٠» بێت دوای «٨٠» هەشتا ڕۆژ بەتەواوی لەلەشدا هەڵدەمژرێ. بەڵام جۆری ترشی پۆلی گلایکۆلیک دوای «١٢٠» ڕۆژ. ڕیخۆڵەی کرۆماوی خێراتر هەڵدەمژرێ. بەجۆرێک کە «٩٠٪»ی داوەکە دوای «٥٠» ڕۆژ هەڵدەمژرێ. دوای «٨٠» ڕۆژیش بەتەواوی هەڵدەمژرێ. جۆری پێنجەم لەداوی تواوە بەکورتی پێی دەووترێ «PDS» کە پتەویەکەی «٤-٦» هەفتە دەخایەنێ و «٥٠٪»ی پتەویەکەی دوای «٤» هەفتە دەمینێتەوە. ئەم جۆرەیان لەماوەی «٦» مانگدا بەتەواوی هەڵدەمژرێ و بەتایبەتی بۆ دوورینەوەی برینی هەوکردو بەکار دەهێنرێت.

ب- **جۆری نەتواوە** «Nonabsorbable» :

١- ئاوریشم و لۆکە «Silk and Cotton» : ماوەی پتەویەکەی نزیکەی ساڵێکەو دوای تەواوبونی دووساڵیش هەڵدەمژرێن. داوی دروست کراو لە ئاوریشم و لۆکە دەستکاری کردنی ئاسانەو گرێدانیشی ئاسانە. بەڵام هەوکردنی برینی لێوە سەرهەڵدەدات.

٢- داوی خۆشکراوی دەستکرد یاخود داوی چەمێنراوە «Braided or twisted» :
أ-پۆلستەر، ب- پۆلستەری تێکهەڵکێشراو بە تێفلۆن. ج- نایلۆن. ئەم جۆرانە کاریگەریان لە ئاوریشم کەمترە، چونکە ئاوریشم چاکتر گرێ دەدرێ و بەتوندی و بەسەلامەتیەوە بەسێ نیوەگرێ دەمینێتەوە. کەچی جۆری پۆلستەر پێویست بەکاتێکی زیاترو هێزێکی زیاتر دەکات بۆ گرێدان. هەروەها دەبێ بەشێکی زیاتر لەماددەی داوەکە لەسەر برینەکەدا بەجێ بهێڵدرێ. داوی دەستکرد گرانبەهاترە لەئاوریشم، کەچی ڕێژەی هەوکردنی برینی دووراوە بەداوی ئاوریشم زیاترە وەک لە داوی دەستکرد. برینی هەوکردو دوای ساڵێک یان زیاتر داوی دوورینەوە فڕێ دەدات.

٣- تاکە کەڵە داوی دەستکرد «Mofilament synthetics» :

أ- پۆلین « Propylene».
ب- نایلۆن. لایەنی چاکی پۆلین و نایلۆن ئەوەیە کە بەکتریا وەکو جۆری ژمارە ۱، ۲ بەخۆیانەوە هەڵناگرن. بەڵام جۆری پۆلین لەنایلۆن باشترە.
٤- تەلی کانزا «Wire»: ئەم جۆرەیان لەهەوکردنی بریندا هیچ رۆڵێکی چاکی نیە. بەڵام لایەنی چاکی ئەوەیە کە بۆ دوورینەوەی ئێسک بەکاردەهێنرێ. بۆ نمونە بۆ داخستنی برینەکانی نەشتەرگەری کۆڵەی سنگ «Sternotomy wounds» بەکاردەهێنرێ.

## قەبارەکانی داوی دوورینەوەی برین:

لەراستیدا ژمارە سفری ئینگلیزی بۆ پێوانی داوی دوورینەوەی برین بەکاردەهێنرێ. دەتوانین پێوانەی «5-0» واتە «پێنج-سفر» بخەینە بەرچاوی خۆمان کە بریتیە لە قەبارەی داوی دوورینەوەی ئاسایی کە بۆ دوورینەوەی جل و بەرگ بەکاردەهێنرێ. ئەمەی خوارەوە خشتەیەکە لە قەبارەکان و بەکارهێنانەکانی داوی دوورینەوەی برین:

| قەبارەی داوی «دەزووی» دوورینەوەی برین بەژمارەی ئینگلیزی | بەکارهێنانەکانی |
|---|---|
| «0» تاوەکو «4-0» | بەکارهێنانی ئاسایی |
| «5-0» تاوەکو «7-0» | نەشتەرگەری ئاڵۆزی لوولە خوێنەکان<br>delicate vascular anastomoses |
| 8-0 تا 10-0 | بۆ کاری مولولە خوێنەکان و نەشتەرگەری چاو |
| 0, 1 | چاکردنەوەی ناوچەی ژێرەوەی بەتینی پێست<br>heavy fascial repair |
| 2, 3, 4, 5 | بۆ ئێسک و ژێیەکان «Tendon» |

بەمەبەستی بەراوردکردن بزانە کەڵە داوێکی قژی ئادەمیزاد هەمان قەبارەی داوێکی دوورینەوەی برینی هەیە کە پێوانەکەی « 6-0» تا «7-0» بێت.

## دەرزیەکانی دوورینەوەی برین:

بەگوێرەی هەبونی کونی دەرزی دوورینەوەی برین، چەند جۆرێک هەن:
دەرزی کون کراو «eyed needle»، کوێرە دەرزی «swaged needle»، ئەو دەرزیانەی کە بەئاسانی داوی پێوە دەکرێ «Loosely swaged needle» (وێنە 3-1,2).

Fig. 3-1. Parts of a needle.

Fig. 3-2. Swaged needles.

بەگـــوێرەی شـێـــوە: دەرزی ڕاست، ٨/٣ی بازنە و ١/٢ و ٨/٥. بەگـــوێرەی نووک و پانەبڕگە: ئەو جۆرەی کە پلە بە پلە نووکەکـــەی تیـــژ دەبێتەوە، دەرزی نـــووک تیـــژ، دەرزی هەردو دیو تیـــژ، دەرزی نـووک پانی لـــەچەشنی وایـــەر «Ground point wire needle» (وێنە 3-3,4).

Fig. 3-3. Shapes of needles.

Fig. 3-4. Point and cross sections.

## قەبارەکانی دەرزی کەوانەیی:

دەرزی کەوانەیی بەهێڵێکی ڕاست پێوانە دەکرێت هەر لەتەوەرەوە تاوەکو لووتکەی دەرزیەکە. ئەمەی خوارەوە خشتەیەکە بە قەبارەکان و بەکارهێنانەکانی دەرزی دوورینەوەی برین:

| قەبارەی دەرزی | بەکارهێنانەکانی |
| --- | --- |
| ٦-٩ملم | نەشتەرگەریی وورد، نەشتەرگەریی چاو. |
| ١-١٥ملم | نەشتەرگەریی دڵ و لوولەخوێنەکان، بۆ منداڵان، کۆئەندامی میز، نەشتەرگەریی دەمار، پێست. |
| ١,٥-٢,٥سم | گەدەو ریخۆڵە، دڵ و لوولەخوێنەکان، داخستنی برین، بەشێوەیەکی گشتی، شانەی نەرم. |
| ٢,٥-٤سم | داخستنی ناوچەی بەتینی ژێرەوەی پێست Heavy fascial closure، داخستنی کۆڵەی سنگ Sternotomy closure |
| ٥-٧سم | ئەو جۆرە دوورینەوەیەی کە داوەکە لەژێر پێستدا گیر دەخوات و بەشێکی زۆری بەرچاو نەبێت Retension sutures |

## قەبارەکانی دەرزی ڕاست «ڕێک»:

٤-٦سم کەپانەبڕگەی بازنەیی بێت: بۆ گەدەو ڕیخۆڵە، پێست.

٤-٦سم لەجۆری تیژی پان: بۆ پێست.

زۆربەی دەرزیە کەوانەیی‌یەکانی دوورینەوەی پێست ٣/٨ی بازنەن. کەچی بۆ نەرمەشانەو ناوچەی ژێرەوەی پێست «fascia» پێویستە پانە بڕگەکەی خڕبێت. بەڵام دەرزی تیژی پان، شوێنەواری داوەکەی بچوکە کەچی بەهۆی توندکردنی داوەکەوە کونەکەی گەورەدەبێت. لەهەمان کاتدا دەرزی تیژی پان، بەکارهێنانی زۆر ئاسانە بۆ پێستی زۆریتەو.

جۆری نووک پانی لەچەشنی وایەر بۆ ئاڵوگۆڕو چاندنی دەستکردی کۆئەندامی سوڕی خوێن و دڵ بەکاردەهێنرێ.

بۆیە «قەبارە» سیفەتێکی زۆر گرنگی دەرزی دوورینەوەی برینە.

## چۆنیەتی گرێدانی داوی دوورینەوەی برین:

پێش هەمو شتێک دەبێ بزانیت کە چۆن؟ لەکوێ؟ کەی؟ برین دەدوورێتەوە. بەڵام ئاگاداری ئەوە بە کە لەهەموویان گرنگتر ئەوەیە: ئایا بۆچی برین پێویستی بە دوورینەوە هەیە؟

چەند جۆرە تەکنیکێک هەن بۆ گرێدانی داوی دوورینەوەی برین کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- تەکنیکی ژمارە (١) واتە تەکنیکی بەکارهێنانی هەردوو دەستەکان بۆ گرێدانی داوی دوورینەوەی برین کەبریتیە لەم هەنگاوانەی خوارەوە:

Step 10

Step 9

Step 11

Step 12

Step 13

٢- تەکنیکی ژمارە (٢) واتە تەکنیکی بەکارهێنانی یەک دەست بۆ گرێدان و دەستەکەی دی بۆ گرتنی سەرە بەرەڵلاکەی داوی دورینەوەی برین کە هەنگاوەکان بەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجام دەدرێن:

**Step 4**

**Step 5**

**Step 6**

Step 7

**تێبینی: نیوەی دووەمی تەکنیکی ژمارە (٢) بریتیە لە هەمان هەنگاوەکانی نیوەی یەکەمی تەکنیکی ژمارە (٣) هەتاوەکو هەنگاوی حەوتەم.**

٣- تەکنیکی ژمارە (٣): ئەم جۆرە تەکنیکەش بەیەک دەست ئەنجام دەدرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

Step 1

Step 2

٤- تەکنیکی ژمارە (٤) کە پێی دەگوترێ گرێی ئامێر یاخود گرێی نەشتەرگەر: لەم تەکنیکەدا گیرە (Forceps) لەگرێدانی داوەکەدا بەم شێوەیەی خوارەوە بەکاردەهێنرێ:

# سڕكردن

## Anesthesia

بۆ منداڵی شیرخۆرو بچوك پێویستیەكی گرنگە كە بەر لەسڕكردن دەرمانی هێمن كەرەوەی بدرێتێ. هەروەك ٥-١٠ ملغم ڤالیۆم بەڕێگای خوێنهێنەرەوە «I.V».

ئەو ماددانەی كە بۆ سڕكردنی شوێنەوار «Local anesthesia» بەكاردەهێنرێن:

١- پرۆكەین Procaine ٢- لیدۆكەین Lidocaine.

ئەو دوانە بە باشترین مادە ناسراون.

٣- بیوپیڤاكەین Bupivacaine: ماددەیەكی گرنگە بەهۆی ئەوەی كەماوەی كاركردنەكەی درێژە.

ئەمەی خوارەوەش خشتەیەكە بەناوی ئەو ماددانەی كە بۆ سڕكردنی شوێنەوار بەكاردەهێنرێن:

| ماددەكان | ماوەی كاركردنیان | ئەوپەڕی هێندەكانیان | خەستی ماددەكان Concentration |
|---|---|---|---|
| ١- پرۆكەین «نۆڤۆكەین» | نزیكەی یەك كاتژمێر | ٧٠٠ملغم | ٠.٥٪ بۆ پالاوتن و داخستنی ناوچەیی Infiltration and field block ٢٪ بۆ داخستنی دەمار Nerve block |
| ٢- لیدۆكەین «زایلۆكەین» | سێ كاتژمێر | ٣٠٠ملغم ٧ملغم/كغم كێشی لەش | ٠.٥٪ بۆ پالاوتن و داخستنی ناوچەیی ١.٠٪ بۆ داخستنی دەمار |
| ٣- بیوپیڤاكەین «ماركەین». | نزیكەی هەشت كاتژمێر | ١٧٥ملغم | ٠.٢٥٪ بۆ پالاوتن و داخستنی ناوچەیی ٠.٥٪ بۆ داخستنی دەمار |

گشت ئەو ماددانەی سەرەوە بە خێرایی دوای ٣-١٠ دەقیقە كاردەكەن.

### بەكارهێنانی كورژكەرەوەی لوولەخوێنەكان لەگەڵ ماددەی سڕكەر:

زۆرجار ماددەیەك لەگەڵ ماددەی سڕكەر بەكاردەهێنرێ هەروەك ماددەی ئەدرینالین كە لوولە خوێنەكان كورژدەكاتەوە. لایە چاكەكانی بەكارهێنانی كورژكەرەوەی لوولە خوێنەكان لەم بوارەدا بریتین لەمانە:

١- كەم كردنەوەی ڕێژەی مژتن كە لەئەنجامدا ڕێژەی بەژەهراوی بوون كەم دەبێتەوە بەمەبستی ڕێگادان بۆ بەكارهێنانی هێندێكی زیاتر لەماددەی سڕكەرەوە.

٢- درێژكردنەوەی ماوەی سڕكردن.

٣- کەم کردنەوەی خوێن بەربوون.

ئەو حاڵەتانەی کە نابێ ماددەی کورژکەرەوەی لوولە خوێنەکان بەکاربهێنرێ:

١- نابێ لەگەڵ ماددەی سڕکەرەوەدا بۆ سڕکردنی پەنجەکانی دەست و پێ و گوێ بەکاربهێنرێ. واتە نابێ بۆ دوابەشەکانی چیوەی لەش بەکاربێت، چونکە دەبێتە هۆی گانگرین.

٢- نابێ بۆ ئەو نەخۆشانە بەکاربهێنرێ کە پاڵەپەستۆی دڵ و لوولە خوێنەکانی چیوەی لەشیان بەرزە.

نیشانەکانی بەکارهێنانی ماددەی سڕکەرەوەی شوێنەوار بەڕادەیەکی زیاتر لە پێویست:

١- لێدانی دڵ نارێک دەبێت. ٢- خێرابوون یاخود هێواش بوونی لێدانی دڵ.

٣- بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن. ٤- هەناسەدانی بێ هێزو خێرا.

ئەو جۆرەی نیشانەکان کە بەرچاوئێن و لەئەنجامی بەکارهێنانی سڕکەرەوەی شوێنەوار بەڕادەیەکی زیاتر لە پێویست پەیدا دەبن:

١- ترسان و شێوانی باری دەروون «کە لەوانەیە بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ».

٢- سەرێشە ٣- هێڵنج و ڕشانەوە ٤- چەمانەوەی ماسولکەکان.

نیشانەکانی ئەو دیاردەیە بەرەبەرە پێش دەکەوێ بۆ ڕاچەنینێکی بەهێز «Convulsion»، لەخۆچوون، هەناسەبڕکێ ئنجا دابەزینی سوڕی خوێن.

## چارەسەرکردن:

دەست بکە بە بەخشینی ئۆکسیجین. بۆ چارەسەرکردنی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ماددەی فەنیلیفرین «نیوسینفرین» بەکاردەهێنرێ بەهێندی ١-٢ ملغم لەناو ١٠ مل گیراوەی خوێی سروشتی بەڕێگای خوێنهێنەرەوە «I.V» بەڵام ئەگەر دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن هەر بەردەوام بوو ٢٠ ملغم فەنیلیفرین لە ٥٠٠ مل گیراوەی دیکستروز ٥٪ لەناودا بەڕێگای خوێنهێنەر بەکاردێت. ئەگەر نەخۆشەکە تووشی فێ لێهاتن بوو «Seizers»، ئەوکاتە ٥ ملغم ڤالیۆمی دەدرێتێ بەڕێگای «I.V».

لەکاتی بوورانەوەی Anaphylactic Shock نەخۆشەکەدا: هێندی ٠,٥- ١مل ئێپینێفرین بەڕێژەی ١/ ١٠٠٠ لەژێر پێست دەدرێت. ئینجا دەزگای خوێنهێنەری بۆ چەسپ بکەو ٠,١ ملغم ئێپینێفرین ١/ ١٠٠٠ی بەهێواشی بدەرێ. ئەگەر دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن هەر بەردەوام بوو ٣٠٠ ملغم میتارامینۆل بایتارترەیت واتە «ئارامین»ی بەخوێنهێنەرو خێرایی بەخشینەکەی بەگوێرەی پاڵەپەستۆی خوێنی نەخۆشەکەیە.

# چۆن گرنگی بە برینێکی توندڕەوت دەدەیت؟

## Care of the acute wound

دەرخستنی پلەی برینەکە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- مێژووی برینەکە: چۆن، لەکوێ، کەی، برینەکە ڕوویداوە؟

٢- پشکنینی شوێنی برینەکە، والاکردنی برینەکە و ئەگەر پێویست بوو وێنە گرتنی شوێنەکە بە تیشکی ئێکس «X ray».

### چۆنیەتی داخستنی برین:

ئەگەر هاتو برینێک لە «٨» هەشت کاتژمێر کەمتری بەسەردا تێپەڕیبو، دەبێ بدوورێتەوە. بەڵام برینی ڕووکەشی پێست «Superficial wounds» لەتوانادا هەیە بەهۆی پارچە پلاستەرێک و بەتوندیەوە برینەکە دابخرێت.

### چۆنیەتی دوورینەوەی برین:

**تێبینی:**

١- ئاگاداریە ئەگەر هاتو دەزووی دوورینەوەی برین زۆر توند شەتەک بدرێ، دەبێتە هۆی نەگەیشتنی خوێن بەناوچەکە. لە کاتی دوورینەوەدا هەردو لێواری برینەکە لەیەکتر نزیک بکەوەو زۆری توند مەکە

٢- بەگوێرەی توانا هەوڵبدە بچوکترین قەبارەی دەزوو بەکاربهێنیت.

٣- تەقەڵی بچوکی لەنزیک یەکتر هەروەک تەقەڵی گەورەی دوور لەیەکتر برینت بۆ دادەخات. بەڵام داوی باریک و تەقەڵی بچوک شوێنەواری داخستنی برینەکە جوانتر دەکات «Cosmetic closure» و تەقەغەی کەمتر دروست دەکات.

### جۆرەکانی برین دوورینەوە:

١- دوورینەوەی پچڕ.. پچڕ «Interrupted Suture» یاخود تەقەڵ... تەقەڵ (وێنە 4-1).

**Fig. 4-1.** Examples of continuous or "running" sutures.

٢- دوورینەوەی بەردەوام «تەقەڵی هەڵاتوو» « **Running Suture** » (وێنە 4-2)

**Fig. 4-2.** Technique for tying off the continuous suture.

٣- تەقەڵی ستوونیی **vertical mattress stitch**
کە بۆ دوورینەوەی ناوچەی قەدو سک و برینی گەورە بەکاردێت. (وێنە 4-3).

**Fig. 4-3.** Vertical mattress stitch.

٤- داخستنی ژێرپێست **subcuticular closure** ئەویش بەبەکارهێنانی داوی تواوە «واتە ئەو جۆرە داوەی کە دوای ماوەیەک خۆی هەڵدەمژرێ» (وێنە4-4) پێوانەی داوەکەش «**4-0**» یاخود «**5-0**» بێت. دوای ئەم جۆرە دوورینەوەیە دەبێ رووکەشی برینەکە بەهۆی پلاستەری تەعقیم کراو توندبکرێت «ئەوجۆرە پلاستەرەی کە ژێرپۆشی پێوەیەو بەبرینەکەوە نانوسێت».

**Fig. 4-4.** Subcuticular wound closure.

## چۆنیەتی فریاکەوتنی سووتان:

دوای دیارخستنی ڕێژەی سەدی سوتان بەبەکارهێنانی یاسای ژمارە «٩»، ئەگەر هاتو ڕێژەی سەدی سووتان لە ٣٠٪ کەمتربو ٥٠٠ مل گیراوەی «ڕینگەر لاکتەیت» لەماوەی یەک کاتژمێردا دەدرێتە نەخۆشەکە «بەڕێگای .I.V» ئەگەر هاتوو لە ٣٠٪ زیاتربوو ١٠٠٠مل لەهەمان گیراوە دەدرێتە نەخۆشەکە.

یاخود لەتوانادا هەیە هێندی گیراوەکە بەم یاسایەی خوارەوە دیاریکرێت:

هێندی گیراوە= ٣٠مل × ــــ ٪ × ــــ کغم

* ئنجا «دیمیرۆل» یان «مۆرفین» دەدرێتە نەخۆشەکە بەڵام بەڕێگای «I.V» نـەک بەماسولکە چونکە بە ماسولکە نارێک دەمژرێ.
* ئەگەر پێویستی کرد، شریقەی دژی گزازی لێ بدە.
* برینەکە بە سابووناوێکی روون پاک بکەوە.
* پفکەی بچوک واز لێ بێنەو پفکەی گەورە چارەسەربکە.
* برینەکە لەتەنی بیانی «Foriegn body» پاک بکەرەوەو شانەی مردووی لێ جیابکەوەو بیبرە.
* ئەگەر برینەکە زۆر پیس بو یان هەشت کاتژمێری زیاتر بەسەردا تێپەڕبو بو. پێویستە داخستنی برینەکە بۆ ماوەی دوو هەفتە دوابخرێ.
* بۆماوەی چوار هەفتە برینەکە بەکراوەیی بەجێ بهێڵە بۆ ئەوەی تەڕیەکەی برەوێتەوە. ئنجا بەشلیی بیبەستەوە. ئەگەر هاتو برینی سووتانەکە قووڵ بو، بەپارچە شاشێکی «Gauze» هەڵێنجراو بەگیراوەیەکی دژە ژیان «Antibiotic» بیپێچەوە هەروەک ماددەی ئایۆدۆفۆر. ئنجا دوای دوو هەفتە برینەکە دابخە.

### چۆنیەتی هەڵقاچینی «لابردنی» دەزووی دوورینەوەی برین:-

بێگومان هێشتنەوەی دەزووی دوورینەوەی برین بەگوێرەی جۆری ناوچەکەیە هەروەک لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

| ناوچەکان | کاتەکانی دەرهێنانی دەزووی دوورینەوە |
|---|---|
| روو لەگەڵ مل Face and neck | دوای ٤-٥ رۆژ. |
| قەد Trunk | دوای ٧-١٠ رۆژ. |
| پەلەکانی سەرەوەو دەستەکان Upper extremities and hands | دوای ١٠-١٢ رۆژ. |
| پەلەکانی خوارەوەو هەردوو پێیەکان Lawer extremities and feet | دوای ١٢-١٦ رۆژ. |

**چەند تێبینی یەک:-**

* زۆرجار پێویستمان بەماددەیەک دەبێت بۆ چەسپ کردنی پەلەکانی خوارەوە بەمەبەستی زووتر چاک بوونەوەی برین، هەروەک شاشی داپۆشراو بە ماددەی زینک ئۆکسایدو کالامایْن. کەدەبێ هەر هەفتەی جارێک بگۆڕدرێ.

* پێویستە برینی سووتان ڕۆژانە ٢-٣ جار بە سابووناوێکی ڕوون پاگژبکرێتەوە. ئنجا بەهۆی چینێکی ١/٨ ئینج لەماددەی سیلڤەر سەلفادایازین داپۆشرێ دوای ئەوە بەچینێکی تەنک لەشاش پاگژ داپۆشرێ.

* بەکارهێنانی دەرمانی دژە ژیان «Antibiotic» لەبرینی هەوکردوودا «Contaminated wound»، پێویست ناکات تەنها لەم حالەتانەی خوارەوەدا نەبێت:-

١- برینی پیس «Dirty wound».

٢- کۆنە برینێکی بنەسیی «Chronic wound» کەتازە هاتبێ بۆ چارەسەرکردن.

٣- ئەوبرینانەی کە مەبەستی پارێزگاری لێ کردن «Conservative therapy» چارەسەرکردنیان سوود نەبەخشێ.

ئەگەر برینێک پێویستی بە دەرمانی دژە ژیان هەبێت لەماوەی چاوەڕێکردن تاوەکو ئەنجامی تاقی کردنەوەی حەساسیەتی دەرمان دەربچێت «Sensitivity test» لەوماوەیەدا ئەودەرمانانە بەکاردەهێنرێت:

١- گرووپی سیفالۆسپۆرین «Wide spectrum cophalosporines».

٢- گرووپی ئەماینۆ گلایکۆزاید «Aminaglycosides».

٣- پەنسلینی نوێی دەستکرد «Newer synthetic penicillins».

هەروەها بۆیەی جێنشن «Gention violet» بۆ ئەو برینانە بەکاربهێنە «بەسرینەوەیان» کە بەهۆی کەڕووەوە «Candida albicans» لەپەلەکانی خوارەوەدا هەودەکەن.

## جۆرەکانی هەوکردنی برین:-

١- هەوکردنی نەشتەرگەری «Surgical infection».

٢- دوومەڵ «Abscess».

٣- یان یاخود لەگەڵ هەوکردنی خانەیی «Cellulitis».

**نیشانەکانی برینی هەوکردو «Signs of infected wounds»:-**

١- ئاوسان Tumor

٢- گەرم داهاتن Calor

٣- سوورهەڵگەڕان Rubor

٤- ئازار Dolor

## هەوکردنی خانەیی نموونەیی Typical Cellulitis :-

ئەم جـۆرە هەوکـردنی برینە بەهۆی جـۆرێک لەبەکـتـریاوە روودەدات کـە پێی دەووترێ «ستریپتۆکۆکای» Streptococci.

چارەسەرکردنیشی بەجێ بەجێ کردنی ئەم پێنج خاڵانەی خوارەوە دەبێت:

١- پەنسلین«Penicillin» . ٢- پشوودان «Rest» . ٣- دانانی گەرمی«Application of local heat» . ٤- دەرکـردنی واتە دەرهێنانی بریناو «Pus» دوادەخرێ تاکو لەناوبرینەکەدا کۆدەبێتەوە.

هەوکردنی خانەیی لەدەوروبەری برینێک، لەسەرەتای داخرانیەوە، هەنگاوێکی تازەیە بۆ هەوکـردنی بەهۆی مـیکرۆبی سـتـریپـتـۆکۆکـای، لەگـەڵ ئەوەی کـە زوو بریناویشی لێ پەیدا دەبێت و دەبێتە دوومەڵ «Abscess».

## ئەو جۆرە برین هەوکردنانەی کە بەنەشتەرگەریی چارەسەر دەکرێن:-
## «Infections treated surgically»

١- هەوکردنی خانەیی «Cellulitis» : بریتیە لەو جۆرە هەوکردنەی کە لەیەک شوێنەواردا جێگیر نابێ و دووچاری چینی ژێرپێست «Subcutaneous Layer» دەبێت. هەندێ جـار لەتوانادا هەیە بەهۆی ماددەی دژە ژیان «Antibiotic» چارەسەر بکرێت.

هەوکردنی خانەیی هەوکـردنی کەناڵی لیـمـفـاوی «Lymphangitis» لەگـەڵدا دەبێت. هەرکاتێک هەوکردنەکە بگاتە گرێ یە لیمفاویەکان، پێی دەووترێ «Lymphadenitis» کـە بەدەرمانی دژەژیان یاخود بەنەشتەرگەریی «Surgery» چارەسەر دەکرێت.

٢-فـیورەنکل یاخود هەوکردنی سیکلدانۆچکەی مووەکان "Furancle "Folliculitis:- بریتـیە لە هەوکردنی بنکەی سیکلدانۆچکەی مووەکان. کەهەندێ جار لەخـۆیەوە دەتەقێ. بەڵام ئەگەر هاتو هەوکردنەکە قووڵ بوو، پێویستە بە نەشتەرگەری چارەسەر بکرێ.

٣- کـاربەنکل « Carbuncle» : جۆرێکی بەتینە لەدوومەڵ کە دووچاری ئەوکەسانە دەبێت کە تووشی نەخۆشیی شەکرە بوون «Diabetic potients» بەزۆریش لەچەند شوێنێکی جیاجیای ناوچەی پشتەملدا «Nape of the neck»چارەسەرکردنی ئەو جۆرە دوومەڵە بریتیە لە شـەق کـردنی دوومـەڵەکـە لەسـەر شـێـوەی نیـشـانەی کـۆکـردنەوە «+» لەگـەڵ مـانەوەی نەخۆشەکە لەنەخۆشخانەدا (وێنە 5-1).

**Fig. 5-1. A,** Technique of cruciate incision for drainage of a carbuncle. **B,** Technique for breaking up loculations within a carbuncle.

٤- فـــــيلۆن «**Felon**» : جۆرە دوومەڵێکی ترسناکە تووشی سەری پەنجە دەبێت. بەچەشنێک کەسەری پەنجە دەئاوسێ و بریناو «**Pus**»ی لێ کۆدەبێتەوە. کە لەئەنجامدا پاڵەپەستۆیەک لەسەری پەنجەدا پەیدادەبێت و لەئاکامدا خوێن ناگاتە ناوچەکەو خانەکانی دەمرن «**Necrosis**» یاخود بە شێوەیەکی کاتیی ئازلر بە دەمارەکان دەگات «**Nerve damage**». جا لەئەنجامی پاڵەپەستۆ خستنە سەر ناوچەکەدا، ئازارێکی زۆر بەتینی لێ پەیدا دەبێت. فیلۆن بەوە چارەسەر دەکرێت دوای سڕکردنی ناوچەکە، شەقێکی کون بەدەر «**Through and through incision**» لیزیک ئێسکەوە بەناو سەری پەنجەدا دەکرێت. بە مەرجێک شەق کردنەکە بەنێو چینی چەوریی پەنجەکەدا تێپەڕێت. بێگومان ئەم کارە لەلایەن پزیشکێکی لێ هاتوو ئەنجام دەدرێت (وێنە 2-5).

**Fig. 5-2.** Technique for surgical drainage of a felon.

٥- دوومـەڵی دەوروبەری کـۆم «Perirectal abscess» : لەسـەرەتاوە هەروەک هەوکردنی کیسی مووەکان و فیـورەنکل دەست پێ دەکات. دوومەڵێکی قووڵە کە لەژێرەوەی کۆمـەوە سەر هەڵدەدات وەکو هەردوومەڵێکی تر چارەسەر دەکرێت. ئەمەش دوای سڕکردنی گشتیی لەش.

٦- پارۆنیـــشـــیا «Paronychia» : بریتـیـە لە هەوکـردنی شـانەی دەوروبەری نینـۆکی پەنجـەکـان. ئەگـەر پشت گـوێ بخـرێ، بنکەی نینۆک تێـک دەشکێ یاخـود دەبێـتـە فـیـلۆن. چارەسـەرکـردنیـشی ئاسـانە چونکە هەوکـردنەکـە رووکـەشی ناوچەکـە دەگـرێتـەوەو پێـویست بەسڕکردن ناکات. لەسـەرەتادا ناوچەکە تەعـقیم دەکرێت ئنجا بەئەسپاییەوە رووی نینۆکەکە بەرزدەکـرێتـەوە هەتاوەکـو بـرینـاو «Pus» لـــەناوچەکـەدا کـــۆدەبێـتــەوە (وێنە 5-3) ئامـۆژگـاری نەخـۆشەکـە بکە کـە رۆژانە دووجـار دەسـتی بخـاتە ناو سـابوناوێکی گـەرمی روونەوە.

Fig. 5-3. Technique for drainage of a paronychia.

هەوکـردنی تازەی برین بەهۆی بەکـتـریای سـتـافـیلۆکـۆکایەوە دەبێت کـە حەسـاسـە بە پەنسلین. بەڵام تاوەکو ئەنجامی فەحسی حەساسیە دەردەچێت، باشـترین دەرمان بریتـیـە لە پەنسلین یاخود یەکەم نەوەی «First generation» سیفالۆسپۆرین.

# تەکنیکی بەخشینی شلە بەرێگای خوێنهێنەرەوە:

## I.V. TECHNIQUES

سەدەیەک لەمەوبەر نەخۆشیی کۆلێرا سکۆتلەندای راماڵی. پزیشکێک بەناوی تۆماس لاتـــــا «Thomas Latta» ووتی کـە مـردن بەهۆی ئەو نەخـۆشـیـەوە، لەئەنجـامی ووشـک بوونەوەی لەش «Dehydration» روودەدات. چارەسەرکردنەکەشی بریتی بوو لەتواندنەوەی خوێی کانزایی لەئاوداو بەخشینی بەنەخۆشەکان بەرێگای خوێنهێنەرەوە.

# کون کردنی خوێنهێنەرەکانی چیوەی لەش:
**«Peripheral venipuncture»**

ئەم کارە بەهۆی دەرزیەکی ڕاستی بۆشەوە ئەنجام دەدرێت. یاخود بەهۆی دەرزی پەپولەوە **«Butterfly needle»** یان دەرزی پێستی سەر **«Scalp vein needle»** کە بۆ منداڵی شیرخۆر بەکاردەهێنرێ. هەندێ جۆری دی هەن کە دەرزیەکەیان لەژوورەوەیەو پلاستیکەکە لە دەرەوە. هەندێکیش بەپێچەوانەوە کە پێیان دەووترێ کاثیتەر هەروەها کانیولا **«Cannula»** یەکێکە لەم جۆرانە (وێنە **6-1**)

**Fig. 6-1.** Tools of venous access: **A** and **B** straight, hollow needles. **C**, butterfly needle. **D**, through-needle catheter. and. **E**, over-needle catheter. Each of these is available from different manufacturers with minor variations.

## هۆیەکانی بێ کەلک بوونی شوێنی کون کردنی خوێنهێنەر:

١- دەرچوونی کانیولا لەشوێنەکەی خۆیەوە.

٢- دەرزیەکە دیواری پشتەوەی خوێنهێنەر کون بکات.

٣- مەیینی خوێن **«Thrombosis»** لەئەنجامی هۆکاری میکانیکی و کیمیاوی کە هەردووکیان بەهۆی داماڵینی شوێنەکەوە ڕوودەدەن.

## شوێنەکانی تەکنیکی خوێنهێنەر:
**«Sites of I.V technique»**

بەر لەهەموو شتێک پێویستە ئەوە بزانین کە ٩٠/١٠ی حالەتەکانی تەکنیکی خوێنهێنەر لەدیوی ناوەوەی باسک **«Forearm»** یاخود لەپشتی دەستەوە ئەنجام دەدرێن. (وێنە **6-2**)

١- خوێنهێنەری باسک **«Cephalic vein»**: ١٠سم لەسەرەوەی مەچەک.

٢- زلە خوێنهێنەری ناوەڕاستی باڵ **«Large median cubital vein»**: لەدیوی ناوەوەی ئانیشکە بەڵام جوولانەوەی ئانیشک کاری لێ دەکات.

٣- خوێنهێنەری پێستەی سەر **«Scalp vein»** **«Temperal vein»**:

لەمنداڵی شیر خۆردا **«Infant»** بەکاردەهێنرێ و دەکەوێتە ژێرەوەی تەنکە پێستی لاجانگی سەرەوە. بۆ ئەو مەبەستەش دەرزی پەپوولە بەکاردێت، کە پێوانەکەی

«٢٧.٢٥.٢٣» بـيـت.
هەروەها لەتواناڤادا هەیە
«٢٧.١٦»یـــــــش
بەکـاربهـێنرێن. بەڵام
باشـترین پێـوانە «١٩»
یان «٢١»ـە.
٤-خوێنهێنەرەکانی
پەلی خـوارەوە «Lower
exterimity veins»:

Fig. 6-2. A, Forearm veins.

ئەم خـوێنهـێنەرانە
لەدوای گـــشت هەوڵەکـــانی دی
بەکاردەهێنرێن:
أ- خوێنهێنەرەکانی پشـتی پێ:
کە تەکنیکێکی ئاسانە.
ب- خـوێنهـێنەری گـۆزنگی پێ
«Saphenous vein»: تـــۆزێـــک
لەپشـــتـەوەی گـۆزنگەو لەڕووکـەشی
پێستەوە نزیکە.
بەڵام خوێنهێنەرەکانی پەلەکانی
خـــوارەوە زۆر پەسند نـاکــرێـن بۆ
تەکنیکی خـوێنهـێنەر چونکە دەبنە
هـۆی خــــوێـن مـــــەیـین لە
خوێنهێنەرەکانی لاق و گواسـتنەوەی
خـوێنی مـەییـو بۆ خـوێنهـێنەری
سی یەکـان کـەمـەترسـیـەکی گـەورەی
هەیە.

Fig. 6-2, cont'd. B, Hand veins. These are easy to see, rarely covered with fat, and relatively strong. Notice the larg cophalic vein at the distal, radial portion of forearm.

## هەنگاوەکانی تەکنیکی خوێنهێنەر:
**«Procedure of I.V technique»**

بێگومان ئەوشتانەی کە پێویستن بۆ ئەم تەکنیکە بریتین لەمانەی خوارەوە:
١- سرنجێک قەبارەکەی ٢-٥٠مل بێت و دەرزیەکەی پێوانە «٢٠-٢٢» درێژیەکەی ١/٢-١ ئینچ بێت.

٢- تۆرنیکا «Tourniquet».

٣- بۆ منداڵان پێویستمان به شه‌پکه دارێک ده‌بێت بۆ نه‌هێشتنی جولانه‌وه‌ی قۆڵ و ئانیشک. چونکه جوولانه‌وه‌ی نه‌خۆشه‌که ده‌بێته هۆی گۆڕینی شوێنی ده‌رزیه‌که، له‌ئاکامدا خوێن مه‌یین له‌ناوچه‌که‌دا ڕووده‌دات.

دوای جێگیرکردنی قۆڵی نه‌خۆشه‌که، له‌دوری ٢ ئینچ له‌سه‌ره‌وه‌ی شوێنی لێدانی ده‌رزیه‌که‌وه، قۆڵی نه‌خۆشه‌که به تۆرنیکا ببه‌سته. هه‌ردو ده‌سته‌کانت بشۆ ئنجا داوا له نه‌خۆشه‌که بکه ده‌ستی بکاته‌وه‌و بقوچێنێته‌وه. شوێنه‌که به‌سپرتۆ «Alcohol» ته‌عقیم بکه. په‌نجه‌ت بخه‌ره سه‌ر خوێنهێنه‌ره‌که له‌دووریی ٢ ئینچ له‌خواره‌وه‌ی شوێنی لێدانی ده‌رزی بۆ قه‌ده‌غه‌کردنی جوولانه‌وه‌و خزینی خوێنهێنه‌ره‌که له‌کاتی کون کردنیه‌وه. له‌دووریی نیو ئینچ له‌شوێنی هه‌ڵئاوسانیه‌وه‌و به‌گۆشه‌ی ٤٥ پله خوێنهێنه‌ره‌که کون بکه. ئینجا به‌ره‌به‌ره به‌ئاراسته‌ی خوێنهێنه‌ره‌که گۆشه‌ی ده‌رزیه‌که که‌م بکه‌وه تاوه‌کو له‌گه‌ڵ قۆڵی نه‌خۆشه‌که ته‌ریب ده‌بێت. دوای ده‌رکه‌وتنی خوێن له‌سرنجه‌که‌دا به‌درێژایی نزیکه‌ی ٣/٤ی ئینجێک ده‌رزیه‌که پاڵده ژووره‌وه. تۆرنیکا بکه‌وه بۆ نه‌هێشتنی داخستنی ڕێڕه‌وی سووری خوێن. ئه‌گه‌ر بۆ به‌خشینی ده‌رمان بێت، به‌هێواشیی ده‌رمانه‌که پاڵ ده‌درێته ناو خوێنهێنه‌ر. ئه‌گه‌ر بۆ به‌خشینی گیراوه بوو، ده‌رزیه‌که به‌پلاسته‌ر چه‌سپ ده‌کرێت چونکه جولانه‌وه‌ی ده‌رزیه‌که خوێنهێنه‌ر ده‌پچرێنێ. نابێ پاڵه‌په‌ستۆ بخرێته سه‌ر ده‌رچه‌ی ده‌رزیه‌که به‌مه‌به‌ستی چه‌سپ کردنی، چونکه ڕێڕه‌وی خوێن ده‌گرێت. دوای ته‌واو بوونی کاره‌که پارچه گۆزێکی ته‌ڕکراو به‌سپرتۆ بخه‌ره سه‌ر جێگای کون کردنی خوێنهێنه‌رو ده‌رزیه‌که ڕاکێشه ده‌ره‌وه (وێنه‌ی 6-3,4,5).

**Fig. 6-3.** Technique of needle puncture of the vein. Notice that needle has been placed through the skin and will be placed through the vein subsequently.

Fig. 6-4. Technique of securing needle to the skin.

Fig. 6-5. A, Technique of inserting butterfly needle and. B and C, securing butterfly needle to skin.

## تەکنیکی خوێنهێنەری ناوەندیی:
## «Central venous technique»

**مەبەستەکان:**

١- بەخشینی خۆراک بەشێوەیەکی گشتیی «Total parenteral nutrition» لەکاتێکدا کە نەخۆشێک نەتوانێ بەرێگای دەمەوە خواردن بخوات.

٢- ئەگەر هاتو رێگایەکانی دی بۆ تەکنیکی خوێنهێنەر لەئارادا نەبوون.

٣- پێوانی پاڵەپەستۆی خوێنهێنەری ناوەندیی «Central venons pressure» ئەویش بریتیە لە چەسپ کردنی مانۆمیتەرێکی گیراوەی خوێی سروشتیی بەقەستەرەیەک، دوای ئەوەی کەسەری قەستەرەکە دەخرێتە ناو شاخوێنهێنەری خوارەوەی دڵSuperior .vena cava

٤- لەکاتی بەکارهێنانی گیراوەی گلوکۆزی پاڵەپەستۆ بەرز واتە Hypertonic glucose nutrition بەمەبەستی خۆراک بەخشینی گشتیی Total parenteral nutrition. بەجۆرێک ئەگەر هاتو خوێنهێنەرەکانی چیوەی لەش بەکاربهێنرێن، دوای چەند کاتژمێرێک

دەبنە هۆی خوێن مەیین، بۆیە ڕێگای چوارەم بەکاردەهێنرێ. بەڵام بەڕێگای خوێنهێنەری مەڵبەندییەوە بەهۆی زۆربوونی ڕێژەوی خوێن لەناوچەی سەری قەستەرەکەوە گیراوەکە ڕوون دەبێتەوەو خوێن مەیین ڕوونادات.

## هەنگاوەکانی تەکنیکی خوێنهێنەری مەڵبەندیی:

نەخۆشەکە لەباری ترێندەلینبێرگ درێژ بکە. نیدلێکی ڕاستی ٧-٨سم بۆ کون کردنی خوێنهێنەری ژێر ئێسکی چەڵەمەی شان «Subclavion vein» بەکاردەهێنرێ. «بێگومان ئەوکارە لەلایەن پزیشکێکی کارامەوە ئەنجام دەدرێت» دوو ڕێگاش هەن بۆ گەیشتنی سەری نیدلەکە بە خوێنهێنەرەکە: چ لەسەرەوە چ لە خوارەوە بێت (وێنە 6-6).

**Fig. 6-6.** Sites of access to the central veins: Infraclavicular, supraclavicular, and internal jugular (between the sternal and clavicular heads of the sternocleidomastoid muscle).

**Fig. 6-7.** Location of the external jugular vein, internal jugular vein, and common facial vein. A catheter is shown entering the external jugular vein after being tunneled under the skin for several centimeters.

### بڕینی خوێنهێنەر «Venous cutdown»:

هەندێ جار خوێنهێنەرەکانی ڕووکەشی لەش ئاشکرا نابن، بۆیە پزیشک ناچاردەبێت ناوچەی یەکێک لە خوێنهێنەرەکان هەڵبدڕێ و قەستەرەی بخاتە ناو. ئەو خوێنهێنەرانەش ئەوانەن:-

١- خوێنهێنەری باسک «Cephalic vein».

٢- خوێنهێنەری گوزینگ «Saphenous Vein».

٣- خوێنهێنەری قۆڵ «Brachial vein».

(وێنە 6-7,8)

دوای ئامادەکردن و هەڵدڕینی ناوچەکە بەچەقۆیەک، سەرێکی دواوەی خوێنهێنەرەکە بەداوێک بەرز دەکرێتەوەو ناوچەی شەق کردنی خوێنهێنەرەکە

**Fig. 6-8.** Location of the saphenous vein.

بەگیرەیەک دەگیرێ و لەسەر شێوەی پیتی ژمارە «٧» حەوت شەقێک بەهۆی مەقەسێکەوە لە خوێنهێنەرەکە دەکرێت. ئنجا قەستەرەیەک «**Catheter**» دەخرێتە ناوی و برینەکەش دەدوورێتەوە. (وێنە **6-9,10,11**).

**Fig. 6- 9.** Venous cutdown technique. **A,** First, expose the vein. **B,** Next, insolate the vien between ligatures.

**Fig. 6-10.** cont'd. Venous cutdown technique.
**C,** Then, make a V-shaped cut in the vein.
**D,** Insert the catheter.
**E,** Secure the catheter with the proximal ligature, and, **F,** Close the incision. Secure the catheter with an additional suture in the skin.

Fig. 6-11. Dressing techniques for venous catheters. **A,** Brachial catheter. **B,** Saphenous catheter.

## کون کردنی خوێنبەر
**: «Arterial Puncture»**

مەبەست لەم تەکنیکە بریتیە لە پێوانی ڕێژەی **Pco2,Po2,PH**. دوو خوێنبەر بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێن: یەکەمیان خوێنبەری مەچەک «**Radial nerve**» (وێنە7-1). دووەمیان خوێنبەری ڕان «**Femoral artery**» (وێنە7-2). ئەو دوو شوێنەش شوێنی هەست

**Fig. 7-1.** Artetial puncture of the radial artery at the wrist. **A,** the needle has entered the skin. **B,** The needle is in the artery in good position. **C,** The needle has impaled the artery and must be pulled back.

پێ کردنی لێدانی دڵن. بەجۆرێک کە بەشێوەیەکی ستوونی و لەو شوێنەی کە هەست بە لێدانی دڵ دەکرێت، نیدلێک دەخرێتە ناو خوێنبەرەکەوە. دوای وەرگرتنی خوێن، پارچە لۆکەیەک بۆ ماوەی ٥-١٠ دەقیقە دەخرێتە سەر ناوچەکە. هەروەها تەکنیکی برینی خوێنبەر هەروەک برینی خوێنهێنەرە (لەسەر شێوەی پیتی ژمارە «٧» حەوت) کە بۆ چەند مەبەستێکی پێوانەیی لە خوێندا بەکاردەهێنرێت. بەڵام برینی خوێنبەری ناوچەی مەچەک «Radial nerve» ئەنجام نادرێت تاوەکو هێزی خوێنبەری زەند «Ulnar potency» نەزانرێت. ئەویش بەهۆی تاقی کردنەوەی «ئالن» «Allen test» کە بریتیە لە بەرزکردنەوەی دەستی نەخۆشەکە بەمەرجێک رووی ناو لەپی لەتۆ بێت ئنجا گرتنی هەردو خوێنبەری کوعبورەو زەند لەم دیوو ئەو دیوی مەچەکەوە بەهێزی چوار پەنجەی هەردو دەستەکانەوە تاوەکو رەنگی ناولەپی نەخۆشەکە کاڵ دەبێتەوە ئینجا بەردانی خوێنبەری زەند بۆ ئاشکرا بوونی چۆنیەتی سووربوونەوەی ناو لەپی نەخۆشەکە، دوای گەڕانەوەی خوێن بۆ ئەو ناوچەیە (وێنە7-3).

**Fig. 7-2.** Technique of femoral artery puncture.

**Fig. 7-3.** Allen test for ulnar artery patency.

## تەکنیکی بایۆپسی

«Biopsy technique»

بریتیە لە وەرگرتنی بەشێک لە شانەیەکی لەش بۆ پشکنینی مایکرۆسکۆپی بەمەبەستی ناسینەوەی نەخۆشی.

**جۆرەکانی بایۆپسی:-**

١- برینە بایۆپسی «Incisional biopsy» کە دووجۆرە: یەکەمیان لەرووکەشی پێستەوە: (وێنە8-1):

دووەمیان برینە بایۆپسی قووڵ: (وێنە 8-2)

سڕکردنی شوێنەوار یاخود ناوچەیی بۆ هەردو جۆرە تەکنیکەکەی برینە بایۆپسی بەکاردەهێنرێ. ئەگەر هاتو ئامێری داخ کردن لە جۆری بچوک لەئامادابێ باشترە بۆ راگرتنی خوێن بەربوون لەناوچەکەدا.

Fig. 8-1. Basic technique for skin lesions.

٢- بایۆپسی کراوە «Open biopsy» بۆ پێست و شانەی ژێر پێست.

Fig. 8-2. Basic tehnique for deep lesions.

٣- بایۆپسی کونکەر «Punch biopsy» بۆ وەرگرتنی نمونەی پێست کاتێک کە پێست رووبەرێکی زۆری تووشی نەخۆشیەک بووبێ یاخود کەروو «Fungi»ی گرتبێ. ئەمەش بەهۆی جۆرە ئامێرێکی کونکەر دەکرێت کە پێوانەکەی ٣ ملم بێت (وێنە8-3)

٤- بایۆپسی دەرزی «Needle biopsy» کە درێژی دەرزیەکە ٢ سم بێت و تیرەکەی ١ملم بێت.

٥- بایۆپسی جگەر «Liver biopsy» کە نیدلەکە ٣-٤سم بێت و دەچێتە ژوورەوەو دەبێ کارەکە لەماوەی ٥-١٠ چرکە ئەنجام بدرێت. نابێ بایۆپسی جگەر بۆ ئەو نەخۆشانە بکرێ کە شلە لە سکیاندا کۆبۆتەوە واتە تووشی «Ascitis» بوون. هەروەهاش ئەوانەی کە کاتی پرۆثرۆمبین «Prothrombine time»یان درێژە واتە

Fig. 8-3. Use of punch biopsy instrument.

Fig. 8-4. Biopsy needle, Tru-cut. A, Biopsy needle. B, Detail of the specimen notch.

Fig. 8-5. Technique for liver biopsy. A, Site of biopsy.

خوێنیان درەنگ دەمەیێ نابێ بایۆپسی جگەریان بۆ بکرێ (وێنە 8-4,5)

نابێ بایۆپسی بۆ ناوچەی مل بکرێت، چونکە شێرپەنجە «Cancer»ی ناوچەی سەرو ملی لەگەڵدا دەبێت. بۆیە پێش ئەوەی بایۆپسی ناوچەی مل ئەنجام بدرێت، پێویستە بەووردیی پشکنینی ڕوانین «ناظور» بۆ ناوچەی گەروو «Pharyngoscopy»و ناوچەی قورگ «Laryngoscopy»ی بۆ بکرێت. هەروەها پشکنینی «Examination» ناوچەی دەم و زمان و کونە لووت ئەنجام بدرێ و پێویستە وێنە تیشکی x بۆ گیرفانەکانی لووت «Sinuses» بگیرێت ئنجا بایۆپسی لەناوچەی ملدا وەربگیرێت. بایۆپسی مۆخی ئێسک لەلایەن پزیشکی تایبەتمەندەوە ئەنجام دەدرێت.

Fig. 8-5, cont'd. B, Insert needle. C, Advance inner part of needle into liver. D, Advance outer part of needle, cutting off biospy.

## دەرکێشانی شلە لە بۆشایی قەفەزەی سنگەوە:

«Thoracentesis»

بریتیە لە دەرکێشانی شلە لەبۆشایی سنگەوە «Plueral cavity» بەمەبەستی ناسینەوەو چارسەرکردنی نەخۆشیی لە نێوان هێڵی خەیالیی دواوەی ژێربالْ و هێڵی ناوەڕاستی شەپکەی شان لەنێوان پەراسووی هەشتەم یان نۆیەمدا (وێنە 9-1).

**پێویستیەکان** «Equipments» :

١- دەرمانی سڕکردنی شوێنەوار «Drug for local anaesthesia».

٢- شووشەی دەرکێشانی شلە «Drainage bottle».

٣- ئامێری هەڵکێشان «Suction machine».

٤- دەمامکی کاغەز «Mask».

٥- دەستکێشی بێ میکرۆب «Sterile gloves».

٦- لوولەشووشەی تاقیگە «Laboratory tubes».

٧- گیراوەی دژەپیس «Antiseptic solution».

٨- دەستەی دەرکێشانی شلە لەسنگەوە «Paracentesis set» کە نیدلێکی ژمارە «٤٥»ی درێژو تیژی لەگەڵدا هەبێت.

٩- پێویستیەکانی پێچانەوەی برین «Equipments for dressing».

**هەنگاوەکان** «Procedures» :

١- مەبەستی ئەو تەکنیکە بۆ نەخۆشەکە ڕاڤە بکە.

٢- نەخۆشەکە لەسەر کورسیەک دابنێ بەچەشنێک ڕووی لەپشتی کورسیەکە بکات و هەردوو قۆڵ و هەردووشانی شۆڕبکاتەوە سەر پشتی کورسیەکە. یاخود لەسەر لێواری قەرەوێلەکەی خۆی دابنیشێ و هەردوو دەستەکانی بخاتە سەر سنگی خۆی بۆ ئەوەی نێوانە پەراسووەکانی فراوان ببنەوە.

٣- هەندێ ئاو لەشوشەیەک بکە بۆ ئامادەکردنی پاڵەپەستۆی نیگەتیڤی بۆشایی سنگ «Negative plueral pressure». (وێنە 9-5,6 لاپەڕە 60).

٤- ناوچەکە بێ میکرۆب دەکرێت.

٥- خاولیەک دەخرێتە ژێرەوەی ناوچەکە.

٦- شوێنەواری کون کردنەکە سڕدەکرێت.

٧- بەچەقۆیەکی ژمارە «٢» پێست کون دەکرێت ونیدلەکە یەکسەر لەسەرووی پەراسوەکەو لەماوەی نێوانە پەراسوەکەوە تێپەڕ دەکرێت. چونکە چەمکی هەستە دەمار «Intercostal bandle»ی ئەو ناوچەیە دەکەوێتە ژێرەوەی پەراسوەکەوە.

٨- دوای خستنە ژوورەوەی بەشێکی کورتی نیدلەکە، هەست بەچوونەژوورەوەی دەکرێت

بۆ ناو بۆشایی قەفەزەی سنگەوە. ئنجا شلەی ناو بۆشاییەکە دەربکێشە دەرەوە بەهۆی سرنجێکەوە کە «٣» سێ ڕێڕەوی هەبێت و سەرپۆشی داخستنیان هەبێت. بۆ ناسینەوەی نەخۆشیی «٢٠» مل هەڵبکێشەو ئاگاداری ئەوە بە کە دەرکێشانی زیاتر لە «١٠٠٠» مل واتە زیاتر لە لیترێک دەبێتە هۆی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێنی نەخۆشەکە.

٩- لەکاتی دەرکێشانی شلە، تێبینی نەخۆشەکە بکە بۆ کاڵ بوونەوەی پێستی ڕوو «Pallor»، هەناسە تەنگیی «Dyspnea»، خێرابوونی لێدانی دڵ «Tachycardia».

١٠- لوولە شووشەی تایبەتی ئامادە بکە بۆ ناردنی شلەی بۆشایی سنگ بۆ تاقیگە.

١١- برینەکە بپێچەوە.

١٢- واچاکە لەپاشاندا وێنەی تیشکی ئێکس بۆ سنگی نەخۆشەکە بگیرێ.

Fig. 9-1. Technique of thoracentesis.

دەرکێشانی دوابەشی شلەکە لەکۆتاییدا، گرنگترین مەترسی هەیە، چونکە سییەکە لەدیواری سنگ نزیک دەبێتەوە. بۆیە واچاکە کە قەستەرەیەکی نەرمی چەماوە بەکاربهێنرێ بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵدڕانی سییەکان «Laceration of the lung» هەروەها قەستەرەی پلاستیکی نەرم زۆر باشە بۆ دەرکێشانی قەبارەیەکی گەورەی شلە لەبۆشایی سنگدا.

## سۆندەی سنگ «Chest tube»:

بریتیە لە چەسپ کردنی تیوبی سنگ بۆ ئەو مەبەستانەی خوارەوە:

١- لابردنی شلە «Removal of fluid». ٢- بەتاڵ کردنی قەفەزەی سنگ لەخوێن و هەوا بەیەکەوە «Haemopneumothorax». ٣- لەکاتی چوونەژوورەوەی هەوا بۆ بۆشایی قەفەزەی سنگ «Pneumothorax».

شوێنی ئەنجامدانی ئەو کارە بریتیە لە ناوچەی نێوان هێڵی پێشەوەو ناوەڕاستی ژێر باڵ «Anterior and midaxillary line» لە ناوچەی حەفتەم، هەشتەم یاخود نۆیەم نێوانە پەراسوودا. هەروەها تیوبی سنگ لەهێڵی پێشەوەی ژێرباڵدا، لەیەکەم یاخود دووەم نێوانە پەراسووشدا لەسەر هێڵی ناوەڕاستی ئێسکی چەڵەمەی شان «تەرقوە» «Midclavicular line» کە بەسەر گۆی مەمکدا تێپەڕ دەبێت، چەسپ دەکرێت(وێنە 9-2). بەڵام نابێ تیوبی ژێرباڵ لەناوچەی سەرەوەدا «High axillary tube» چەسپ بکرێت چونکە ئازاری زۆرەو ڕێگا لە جوولانەوەی قۆڵی نەخۆشەکە دەگرێ و لەبەر ئەوەی ناوچەکەش ژمارەیەکی زۆر لەگلاندەکانی ئارەقەکردنی تیادا هەیە، بۆیە چەسپ کردنی تیوبی سنگ لەم ناوچەیەدا زیاتر تووشی هەوکردنی دەکات. بڕوانە (وێنەی 9-3) دەربارەی چۆنیەتی چەسپ کردنی سۆندەی سنگ. هەروەها (وێنەی 9-4 لاپەڕە 60) دەربارەی چۆنیەتی دەرکێشانی سۆندەکە دوای تەواوبونی کاری پێویست و چۆنیەتی پێچانەوەی برینەکە لەکۆتاییدا.

**Fig. 9-2.** Placing a chest tube. **A,** Site. **B,** Dissecting through chest wall. **C,** Final Position.

**Fig. 9-3.** Secuting a chest tube- single suture techinque. The suture should be loose, and the surgeon's knot tied down loosely. A tight suture may cause skin necrosis.

Fig. 9-4, Removing a chest tube. The single suture technique can be used (Fig. 9-3). A, Unwrap the suture from around the tube. Have the palient breathe in and do a Valsalva maneuver. Pull the tube. B, Tie the suture down while the patient is still straining down.

Fig. 9-4, cont'd. C, Place Vaseline gauze over the wound, to further occlude the tract, and cover this with gauze and tape.

Fig. 9-5. Chest tube and chest bottle. A, Air escaping on expiration, with positive pleural pressure. B, Air unable to enter on inspiration, with negative pressure.

Fig. 9-6. Full chest bottle, showing that there is a 20 cm of back pressure on the one- way valve.

## دەرکێشانی شلە لەپەردەی دڵەوە:

«Pericardial centesis»

بریتییە لە دەرکێشانی شلە لەپەردەی دڵەوە بێ ئەوەی دەست لەدڵ بدرێ بۆ ئەو مەبەستانە:

١- بۆ ناسینەوەی نەخۆشیی «Diagnosis». ٢- کۆبوونەوەی شلە لەپەردەی دڵدا دەبێتە هۆی پاڵەپەستۆ خستنە سەر دڵ واتە دڵەکوتە «Pericardial tamponade» بۆیە دەرکێشانی بەشێکی کەمیش بێ لەم شلەیە، مایەی ڕزگارکردنی ژیانی نەخۆشە.

**هەنگاوەکان «Procedures»:** شوێنی ئەنجامدانی ئەم تەکنیکە لە (وێنە 7-9) ڕوون کراوەتەوە هەنگاوەکانیشی بریتین لە مانەی خوارەوە:

١- دەرمانی بەر لەتەکنیکەکە: دەبێ مۆرفین ٥-١٥ ملغم یاخود میپیریدین ٥٠-١٠٠ملغم لەژێر پێستدا s.c بدرێ بەنەخۆشەکە. ٢- نەخۆشەکە لەباری نیمچە دانیشتن دابنێ بەمەرجێک پاڵپشتێکی هەبێت «ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر هات و هێندی شلەی دەوروبەری دڵ کەم بێت». ٣- ناوچەی سەرەوەی سک و خوارەوەی سنگ ئامادە بکەو بە چەرچەفی نەشتەرگەریی دایپۆشە. ٤- پاش تەعقیم کردنی ناوچەکە نیدلێکی دەرکەوانە «Gauge» ١٨-٢٠ بێت و درێژییەکەی ٢,٥ ئینج بێت لەناوچەی ژێرەوەی زیادە خەنجەری کۆڵەی سنگەوە «Xyphoid process» و بەلای چەپداو بەگۆشەی ٢٥-٣٥ پلە لەگەڵ پێستدا بەمەرجێک نیدلەکە ئاڕاو بەشی سەرەوەی سنگ و بۆ بەشی دواوەی شانی چەپ ئاراستە بکرێت. واچاکە برینێکی بچوک «دوای سڕکردنی شوێنەوارەکە» بەهۆی چەقۆیەکی ژمارە «٢» لەناوچەکەدا بکرێ بۆ ئاسان کردنی چوونە ژوورەوەی نیدلەکە. ٥- شلەی ناوچەکە هەڵدەکێشرێ بۆ دەرەوە. بەڵام خاڵی پڕ لەمەترسی دوابەشی شلەکەیە هەروەک لە دەرکێشانی شلە لەقەفەزەی سنگدا باس کراوە «کە نیدلەکە دەگاتە دڵ، سرنجەکە لەگەڵ لێدانی دڵ هەڵبەزو دابەز دەکات». ئەگەر هاتو هێندی شلەی پەردەی دڵ زۆر بێت، دەرکێشانەکە لەنێوانە پەراسووی پێنجەمی لای چەپی سنگەوە ئەنجام دەدرێت. لەدووری ١-٢سم لە کۆڵەی سنگەوەو سرنجەکە بەرەو بڕبڕەی پشت ئاراستە دەکرێت. لەهەردوو باردا پاڵەپەستۆی نێگەتیڤ لەسرنجەکەدا دروست دەکرێت واتە نابێ ماوەی ئەوە بدرێ کە هەوا بچێتە ژوورەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە خوێنی دەوروبەری دڵ نامەیێ بەڵام خوێنی ناوەوەی دڵ دەمەیێ. واچاکە نەخشەکارەبایی دڵ ECG لەگەڵ ئەم تەکنیکەدا ئەنجام بدرێ. دوای پەیوەست کردنی گەیەنەری V بەسرنجەکەوە. بەجۆرێک ئەگەر هاتو نیدلەکە بچێتە ناو دیواری سکۆڵەوە، برگەی S-T لە ECG بەرز دەبێتەوەو کورژبوونەوەی پێنەگەیشتووی سکۆڵەش پەیدا دەبێت «Ventricular premature contractions».

ئەگەر هاتو دەرکێشانی شلە دووبارە بکرێتەوە، قەستەرەیەکی پلاستیکی لەگەڵ نیدلەکە

ناراستەی پەردەی دڵ دەکرێت و نیدلەکە دەردەکێشرێتە دەرەوەو قەستەرەکە دەمێنێتەوە بۆ دووبارە کردنەوەی تەکنیک. کۆبوونەوەی خوێن و قەتماغە کردنی لەناوچەی چوونە ژوورەوەی نیدلەکەدا، بەهۆی پشوودانی نەخۆشەکە لەسەر جێگادا کەمتر دەکرێتەوە. هەروەها کەم کردنەوەی خوێ لەخۆراکداو بەکارهێنانی دەرمانی میزهێنەر «Diuretics»یش ڕێژەی کۆبوونەوەی خوێن و قەتماغەکردن کەم دەکەنەوە. دەرمانی دیجیتالیس بۆ تێک چوونی ئاوازی دڵ «Arrhythmia» و پەک کەوتنی ماسولکەی دڵ Mycocardial failur بەکاردەهێنرێ. ئەگەر نەخۆشەکە تووشی هەوکردنی پەردەی دڵ «Pericarditis» بوو، دوای بەخشینی دەرمانی دژەژیان «Antibiotic» نەخۆشەکە پێویستی بەنەشتەرگەریی کردنەوەی سنگ و کردنەوەی پەردەی دڵ دەبێت.

Fig. 9-7. Pericardiocentesis.

## دەرکێشانی شلە لەسکەوە:

**«Abdominal paracentesis»**

بریتیە لە دەرکێشانی شلە لەسکەوە بێ ئەوەی تیوبەکە بەبەردەوامیی لەسکدا بەجێ بهێلدرێ. بەپێچەوانەوەی ناوچەی سنگ (وێنە 9-8).

مەبەستەکان «Indications»:

١- بۆ چارەسەرکردنی کۆبوونەوەی شلە کە دەبێتە هۆی: أ- هەناسە برکێ لەئەنجامی پاڵەپەستۆ خستنە سەر ناوپەنچکەوە. ب- ڕێگا لە پڕبوونی میزڵدان دەگرێت و ناهێڵێ بگاتە قەبارەی سروشتیی.

٢- بۆناسینەوەی نەخۆشیی «Diagnosis»: هەروەک پشکنینی: أ- پرۆتین: ئەگەر لە ٣گم/ ١٠٠مل کەمتربوو نیشانەی نەخۆشیی جگەرەو ئەگەری تێک چوونێکی گشتیی

لەلەشدا هەیە. بەڵام ئەگەر لەم ژمارەیە زیاتر بوو، گرێ «Tumor» یاخود هەوکردن دەردەخات. کەچی لەئەنجامی شەمێ بوونی جگەر «Cirrhosis»، لە ٤گم/١٠٠ مل زیاتر دەبێت. ب- ڕەنگی شلەی سک خۆی ڕوونە. ئەگەر لیێڵ بوو «Turbid» هەوکردن دەردەخات. ئەگەر خوێناوی بوو، نیشانەی شێرپەنجەو نەخۆشیی «سل» «Tuberculosis»ـە. کەم وا ڕێک دەکەوێ کەڕەنگەکەی وەکو شیر بێت «Milky»، بەزۆریی دەگەڕێتەوە بۆ شێرپەنجەی لیمفاویی «Lymphoma». ج- پشکنینی خانەکانی خوێن. د- بۆ پشکنینی شانەیی خانەکان. هـ- چاندن «Culture»و پشکنینی ئەمایلەیز.

**پێویستیەکان:**

١- دەرمانی سڕکردنی شوێنەوار. ٢- دەستەی دەرکێشان «Paracenteses set» کەنیدلێکی دەرکەوانە «٢٠-٢٢»ی تیادابێ. ٣- دەستکێشی تەعقیم کراو. ٤- شاشی تەعقیم کراو. ٥- پێویستیەکانی دوورینەوەو پێچانەوەی برین. ٦- دەمامکی کاغەز «Mask». ٧- شووشەیەک بۆ کۆکردنەوەی شلە. ٨- ماددەی تەعقیم کردن.

**هەنگاوەکان:**

١- ئەم تەکنیکە بۆ نەخۆشەکە ڕاڤە بکە. ٢- بۆلابردنی هەناسە بڕکێ، نەخۆشەکە لەباری نیمچە دانیشتن «Fowler's position» دابنێ. بەڵام بۆ پشکنینی شلەی سک واتە بۆ ناسینەوەی نەخۆشیی، نەخۆشەکە لەسەر پشت درێژ بکە. ٣- ناوچەیەکی فراوان لەپێست ئامادە بکە. ٤- ناوچەیەکی بچوک بەشێوەی بازنە لە خوارەوەی هێلی ناوەراستی سک سڕبکە (لەنێوان ناوک و کۆتایی ناوچەی میزڵداندا «عانە» «Pubis»). چونکە ئەو ناوچەیە واتە بەشی خوارەوەی سک زۆرتر هەڵدەئاوسێ، چینێکی تەنکە، لوولە خوێنی گەورەی تیادانیە، هیچ ئەندامێک لەناوچەکەدا بەیەکترەوە نانوسێن. هەروەها ئەو ناوچەیە چەوریشی کەم تیاداهەیە. دوور بکەوە لە هەر شەق کردنێکی پێشو لەبەرپێکەوەلکان «Adhesions». هەروەها دووربکەوە لەوناوچەیەی کە ریخۆڵەی تیادابەسکەوە نووساوە.

ئەگەر هات و نەخۆشەکە نەشتەرگەریی گەورەی لەناوچەی حەوزدا بۆ کرابو، ناوچەی سەرەوەی سک بەکاربهێنە، نەکەی ریخۆڵە کون بکەیت. ٥- دوای شەق کردنی پێست بە چەقۆیەک، نیدلێکی پێوانە ٢٠ یان ٢٢ بەکاربهێنە. یان قەستەرەیەک کە نیدلێکی تیادابێ یاخود نیدلێک قەستەرەیەکی تیادابێ بۆ قەبارەیەکی گەورە لەشلەمەنی ناوسکدا «هەروەک ئەوەی کە بۆ شۆرینی گورچیلە بەرێگای پریتۆنەوە» بەکاردێت. ٦- تیوبێکی سێ لایەن بەنیدلەکەوە چەسپ بکە. ئنجا شلەی ناوسک هەڵکێشە دەرەوە بێ ئەوەی ڕێگا بە هەوا بدەیت بچێتە ناو بۆشایی پریتۆنەوە. ٧- هەرهەوڵێکی سەرکەوتو دەبێتە هۆی وون کردنێکی پر لە مەترسی لەشلەی لەشی نەخۆشەکە. خێرا هەڵکێشانی «١-٢» لیتر، دەبێتە هۆی وون کردنی قەبارەیەکی گەورە لە شلەی ناوەوەی لەش. بۆیە زیاتر لەیەک لیتر

هەڵمەکێشە بۆ ئەوەی پاڵەپەستۆی خوێن دانەبەزێ. یاخود دوای تێپەڕبوونی ١-٢ کاتژمێر لەسەر دەرکێشانی شلەمەنیەوە، ئینجا بەشێکی دی دەرکێشە دەرەوە. دەرکێشانی شلەی ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢-٣ ڕۆژ، باشترە لەلابردنی گشت قەبارەکەی بەیەک جار. نیدلی گەورەش بەکارمەهێنە چونکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک شلەی لێ دەچۆڕێتەوە «Leakage» و دەبێتە هۆی هەوکردنی پریتۆن.

**Fig. 9-8.** Paracentesis. **A,** Placement of the needle in the lower midline. An over needle cannula technique is best. **B,** Ideal position of patient, with drainage technique.

## دەرکێشانی شلە لەبۆشایی پریتۆنەوە:

**«Peritonial Lavage»**

بریتیە لەتەکنیکی ناسینەوەی برینی ناو سک دوای لێدانێکی ناوچەی سک بێ ئەوەی بریندار بووبێ. کەلەمەیدانی نەشتەرگەریدا بە مەبەستی ناسینەوەی خوێن بەربوونی ناو سک لەهەنگاوێکی زوودا (وێنە 9-9) پێش ئەوەی خوێنبەربوونەکە ببێتە هۆی پەیدابوونی نیشانەی نەخۆشیی. ئەم تەکنیکە لەم حاڵەتانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

١- دوای لێدانی سک «**Abdominal trauma**».

٢- دارنین و داماڵینی دیواری سک «**Abrasions and contusions**».

٣- ئەو نەخۆشانەی کە لەهۆش خۆیان چوینە «**Comatose patients**» و سکیان لێدراوە.

٤- پەک کەوتنی دەمار «**Neurologic deficits**» کە نیشانەکانی سک بشارێتەوە.

٥- شکانی پەراسووەکانی خوارەوە «**Fracture of the lower ribs**».

٦- شکانی ناوچەی حەوز «**Fracture of the pelvis**».

٧- بۆ ئەو نەخۆشانەی کە لەچەند شوێنێکدا سکیان لێدراوە، کە پێویستیان بە

فریاکەوتنی نەشتەرگەریی دەبێت بۆ ڕێگاگرتن لە دابەزینی سووری خوێن کە لە ژێرسڕکردندا لە ئەنجامی خوێنبەربوونی ناو سکدا ڕوودەدات.

٨- هەروەها دەرکێشانی شلە لە پریتۆنەوە لەکاتی ڕوودانی برینی کونکەری سکدا ئەنجام دەدرێت بەمەرجێک برینەکە بەروون و ئاشکرایی و بەتەواویی بەدیارنەکەوتبێ.

**Fig. 9-9.** Technique of peritoneal lavage. **A,** Position of skin incision. Inset shows detail of skin incision, which is intended to expose inferior umbilical ring and lower midline fascia.

**Fig. 9-9 cont'd. B,** Insertion angle. The object is to direct the catheter into the pelvis. **C,** Placement. After exposing the fascia, make a short (3-4mm) incision in lower midline fascia just at inferior umbilical ring. Grasping edges of incision with towel clamps, push dialysis catheter with trocar through peritoneum. Although a moderate amount of force is required to puncture the peritoneum, care must be taken that trocar does not penetrate more than two or three centimeters into abdomen. then, remove trocar and advance catheter into pelvis along angle shown in **B,** Instill 1000 ml of lactated Ringer's solution into the abdomen, and allow it to drain out into the bottle.

## ئەو حالەتانەی کە نابێ شلەی پریتۆن دەربهێنرێت:

## «Contraindications»

١- میزگیران «**Urinary retention**»ی هاوکات لەگەڵ پڕبوون یاخود هەڵئاوسانی میزڵدان.

٢- سک پڕیی «**Graved uterus**».

٣- شین هەڵگەڕانی سک لەئەنجامی ئازارگەیشتن بە دیواری سک.

٤- نیشانەی نەشتەرگەریی لەمەوبەر لەبەشی خوارەوەی سکدا.

## هەنگاوەکانی دەرکێشانی شلە لە پریتۆنەوە:

١- پشکنینی سکی نەخۆشەکە بۆ قەتماغەی «Scar» برینی نەشتەرگەریی و سک پریی.
٢- بەتاڵ کردنی میزڵدان بەهۆی قەستەرەیەکەوە. ٣- ئامادەکردن و سڕکردنی پێستی سک «تاشینی پێستی سک بەقەد نەشتەرگەریی والاکردنی سک. ٤- شەقێک بەرەو بازنەی خوارەوەی ناوک دەکرێت لەسەر شێوەی کەوانەیەک. ٥- برینەکە هەڵدڕە تاوەکو هێڵی ناوەڕاستی سک «Linea alba». ٦- خوێن پژان لەناوچەکەدا قەدەغە بکە بۆ نەهێشتنی خوێناوی بوونی ناوچەکە. ٧- «١» سم٣ لیدۆکەین تێکەڵ بە ئیپینیفرین دەکرێ و لەچینی خوارەوەی ژێر پێست دەدرێت «Fascia». ٨- چینی خوارەوەی ژێر پێست بەهۆی گیرەیەکەوە بەرزدەکرێتەوە. ٩- چینی خوارەوەی ژێر پێست دەبڕدرێ و دەخرێتە ناو پریتۆن.
١٠- برینێکی بچوک دروست دەکرێ و قەستەرەکە بەجوولانەوەیەکی بازنەیی دەخرێتە ناو بۆشایی پریتۆنەوە بەمەرجێک قەستەرەکە بەرەو بڕبڕەی ئێسکی سێبەندەوە «Sacrum» ئاراستە بکرێت ئینجا بەرەو چاڵایی سێبەندەوە. ١١- پێکهاتوەکانی هەڵبکێشە دەرەوە بەلام ئەگەر هاتو خوێنێکی ساف بوو، بەزەرداو ڕەنگین بوویو، میز بوو، یان پاشەڕۆ بوو، بیگێڕەوە شوێنەکەی خۆی. ئەگەر هاتو هیچ شتێک نەبوو، قەستەرەکە بەئامێری شلە بەخشینەوە چەسپ بکەو یەک لیتر گیراوەی خوێی سروشتیی «١٥مل/کگم» لەماوەی «٢٠» دەقیقەدا لە بۆشایی پریتۆن بکە. ١٢- لەوکاتەی کە هێشتا شلە لەناو تیوبەکەدا مابێ، شووشەی شلە بەخشینەکە لەسەر ئەرز دابنێ و بەشێوەی سیفۆن شلەی ناو سک دەربکێشە دەرەوە لەئەنجامدا بەلایەنی کەم دەبێ «٧٠٠»مل بگەڕێتەوە. ئەگەر هاتو کەمتر بوو، ئەوە دەگەیەنێ کە لێکۆڵینەوەکە ڕاست نیە (وێنە 9-10). ١٣- ئەو شلەیەی گەڕاوەتەوە پێویستە تاقی کردنەوەی : أ- چاندن و حەساسیەتی بۆ بکرێ «Culture and sensitivity». ب- تاقی کردنەوەی ئەمایلەیز. جـ- بۆیەی گرام. د- ژماردنی خانەکان بکرێت. ١٤- دوای بەسیفۆن کردنی گشت شلەی پریتۆن، قەستەرەکە دەربهێنە دەرەوەو پێستی سک بەدەزوویەکی پێوانە «0-4»ی نایلۆن دەدوورێتەوە. پەیدابوونی خڕۆکە سوورەکان لەناو شلەی پریتۆن لەهەموو شتێک گرنگترە. بەم شێوەیەی خوارەوە:

ئەگەر هاتو ژمارەی خڕۆکە سوورەکان زیاتر بێت لە «١٠٠.٠٠٠» خڕۆکە لە لیترێکی شلەی پریتۆن، نەخۆشەکە پێویستی بە نەشتەرگەریی دەبێت. ئەگەر هاتو لە «٥٠.٠٠٠» کەمتر بوو بەنێگەتیڤ لەقەلەم دەدرێت. لەئەنجامی برینی کونکەری ناوەڕاست و بەشی خوارەوەی سکدا، ژمارەی خڕۆکە سوورەکان لە «١٠٠.٠٠٠» خڕۆکە / لیتر زیاتر دەبێت. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە نەخۆشەکە تووشی برینی ناوسک بوە. لەئەنجامی برینی نزیک لێواری پەراسووەکانەوە لەناوچەی نێوان گۆی مەمک و ناوکدا ژمارەی خڕۆکە سوورەکان لە «٥٠.٠٠٠» خڕۆکە/ لیتر زیاتر دەبێت و پێویست بە والاکردنی ناوچەکە دەکات چونکە ئەو دیاردەیە بەهۆی برینی ناوپەنچک ڕوودەدات. کەچی لەبرینی گوللەی تەقەمەنیدا ژمارەی

خرۆکە سوورەکان لە «٥٠٠٠» خرۆکە/لیتر زیاتر دەبێت و پێویست بە نەشتەرگەری دەکات. ئەگەر هاتو ژمارەی خرۆکە سپیەکان W.B.C لە «٥٠٠» خرۆکە/لیتر زیاتر بێت، پێویست بە والاکردنی سک دەکات. زیادبوونی ئەمایلێزو هەبوونی بەکتریا لەبۆیەی گرام و پەیدابوونی بەکتریا لەچاندندا، پێویست بە والاکردنی سک دەکەن. بەڵام دەرکێشانی شلەی ناو پریتۆن دووسوودی سەرەکی هەیە کە بریتین لە یەکەم کەم کردنەوەی رێژەی نەشتەرگەریی والاکردنی سک. دووەم زوو ناسینەوەی برینی سک.

**Fig. 9-10.** Peritoneal lavage. After all the fluid has drained into the abdomen, lower the bottle to siphon out the fluid.

## کون کردنی بڕبڕەی کەلەکە

**«Lumbar Puncture»**

بریتیە لە تێپەڕکردنی نیدلێک بەرەو ناوچەی ژێر عەنکەبووتیی **Suborachnoid space** بۆ وەرگرتنی نموونەی شلەی دڕکە مۆخ **C.S.F** بەمەبەستی ناسینەوەو چارەسەرکردنی نەخۆشیی (وێنە **9-11**).

**مەبەستەکان «Indications» :-**

١- ناسینەوەی هەوکردنی پەردەی دەماغ «**Meningitis**».

٢- پشکنینی خوێن بەربوونی ژێرەوەی ناوچەی عەنکەبووتیی.

٣- سڕکردن «**Anaesthesia**» لەکۆتایی دڕکەمۆخدا «**Epidural**» ئەو جۆرە سڕکردنە لەناوچەی ژێرەوەی عەنکەبووتیەوە ناکرێت. کەچی سڕکردنی شوێنەوار **Local an-aesthesia** لەکلکەی «بەشی خوارەوەی» دڕکەمۆخدا «**Epidural space**» دەکرێت.

٤- بەخشینی دەرمان «**Medication**».

٥- پێوانی پاڵەپەستۆی شلەی دڕکەمۆخ.
٦- بەخشینی بۆیەی ڕەنگین کردنی وێنەتیشکاوی «Radiopaque dyes».

**هەنگاوەکان:**

١- تەکنیکەکە بۆ نەخۆشەکە ڕاڤەبکە. ٢- نەخۆشەکە لەباری دانیشتن دابنێ بەمەرجێک لای سەری بەرەو ئەژنۆی بچەمێنێتەوە یاخود لەباری پاڵ کەوتنی سەر تەنیشت و چەمانەوەی لای سەری بەرەو ئەژنۆکانی بەمەبەستی فراوان بوونەوەی نێوانە بڕبڕەکان. ٢-پێستی ناوچەی پشت لەناوچەی نێوان بڕبڕەی پەراسووی دوانزەهەمەوە تاوەکو لێواری سەرەوەی سێبەندەی نەخۆشەکە «Upper margin of the sacrum». ٣- واپەسند دەکرێ ناوچەکە دوای تەعقیم کردن، سڕکردنی شوێنەواری بۆ کرێ. ٤- بێ ئەوەی نەخۆشەکە بجوولێتەوە، نیدلێکی دەرکەوانە (٢١-٢٤) و درێژیی «٢.٥» ئینج بەگۆشەی «٢٠-٣٠» پلە دەخرێتە نێوان بڕبڕەی کەلەکە «Lumbar»ی سێیەم و چوارەم یاخود نێوان چوارەم و پێنجەم. چونکە دڕکەمۆخ لەناوچەی بەشی سەرەوەی بڕبڕەی دووەم کۆتایی دێت. ٥- ئامێری پێوەری پاڵەپەستۆی شلەی دڕکەمۆخ «Obturator» لەسەر نیدلەکە چەسپ دەکرێت بۆ پێوانی پاڵەپەستۆی شلەکە. ٦- تێبینی نەخۆشەکە دەکرێت بۆ نیشانەکانی بوورانەوە «Shock»، هێڵنج «Nausea»، ڕشانەوە «Vomiting». ٧- نموونەی شلەی دڕکەمۆخ دەخرێتە ناو تیوبی تایبەتیەوەو بەرەو تاقیگە ڕەوانە دەکرێت. ئەگەر هاتو ڕەنگی شلە لێڵ بوو، وادیارە نەخۆشەکە تووشی هەوکردنی پەردەی دەماغ بوە «Meningitis». ئەگەر زەرد بوو، مانای وایە تووشی خوێنبەربوونێکی کۆن بوە. ٨- دوای تەکنیکەکە، نەخۆش لەسەر پشت درێژ دەبێت «Dorsal positon».

**ئەو حاڵەتانەی کە نابێ کون کردنی بڕبڕەی کەلەکە ئەنجام بدرێ:**

١- هەوکردنی شوێنەواری نزیک کون کردنی بڕبڕە.
٢- بەژەهراوی بوونی خوێن «Septicemia».
٣- هەر نیشانەیەکی بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی شلەی دڕکەمۆخ هەبێت.

Fig. 9 -11. Lumbar puncture.

## قەستەرەی میزڵدان

«Bladder catheterization»

هەرچەند لەتوانادا هەبێ پێویستە نەخۆش لە قەستەرەی میزڵدان دووربخرێتەوە چونکە ئەگەر هاتو نەخۆش لەتوانایدا هەبێت، میزکردنی ئاسایی باشترین ڕێگایە بۆ بەتاڵ بوونی میزڵدان. ئەمەش نەک تەنها لەبەرئەوەی قەستەرە نارەحەتیی و برینداربوونی لێوە سەرهەڵدەدات. بەڵکو یەکەمین هۆ تووش بوونی نەخۆشەکەیە بە میزێکی باسیللایی «Bacilluria» کە لەوانەیە بەتەنها یەک جاری قەستەرەکردن، ڕوویدات، بەجۆرێک کە «٩٥ ٪»ی نەخۆشەکانی کە بەردەوام قەستەرەیان بۆ دەکرێت، دووچاری دەبن. ئەمەش چارەسەرکردنەکەی گەلێ زەحمەتە.

**مەبەستەکانی قەستەرەکردنی میزڵدان:**

١- نەبوونی توانای میزکردن لەئەنجامی :- أ- میزگیران «Urinary obstruction». ب- خاوبوونەوەی میزڵدان یەکسەر دوای نەشتەرگەریی. جـ- نەخۆشیەکانی دەمار «Neurologic diseases».

٢- بۆ ناسینەوەی نەخۆشیەکانی دەمار. ٣- پێوانی هێندی دەرچوو لەمیزی نەخۆشەکە لەحالەتی: أ- چارەسەرکردنی بوورانەوە «Shock». ب- گیروگرفتەکانی چارەکردن بە شلە.

٤- وەرگرتنی نموونەی میز «Urine specimen» ئەگەر زۆر پێویست بێت.

**ئەو حالەتانەی کە نابێ قەستەرەی میزڵدان بکرێت:**

گشت جارێک ئەگەر هاتو نەخۆش ناوچەی حەوزی کوترابوو «Pelvic trauma» دەبێتە هۆی هەڵپچرانی بۆڕی میز. بۆیە لەهەر کارەساتێکدا کە ناوچەی حەوز ئازاری پێ گەیشتبێ، پێویستە وێنەیەکی تیشکی ئێکسی ڕەنگین بۆ نەخۆشەکە وەربگیرێت بەمەبەستی ناسینەوەی داپچڕانی بۆڕی میز.

**هەنگاوەکانی قەستەرەی میزڵدانی پیاوان:**

١- نەخۆشەکە لەسەرپشت درێژ دەبێ و هەردوولاقی نەختێک بەرەو دەرەوە دەکرێنەوە.

٢- ناوچەی بۆڕی میز بەشلەیەک یاخود بەگیراوەی سابوناو بەهۆی پارچە لۆکە پاک دەکرێتەوە.

٣- ئەندامی نێرینە «Penis» بەرزدەکرێتەوەو ئەگەر نەخۆشەکە خەتەنە نەکرابوو، پێستەکەی وەردەگێردرێ و شلەیەکی ڕوونی دژ بە هەوکردنی بەسەردا دەکرێت.

٤- قەستەرەکە بەچاکیی بەماددەیەکی نەرم کەرەوە چەور بکەو بەئەسپایی ڕەپێشی بکە تاوەکو میزی پێدا دەگەڕێتەوە «بێگومان پێویستە دەستکێشی تەعقیم کراو بەکاربهێنرێ و گشت تەکنیکەکە بە تەعقیمەوە ئەنجام بدرێت و نابێ قەستەرەکە بە توندو تیژیەوە ڕەپێش

بخرێت لەبەر ئەگەری بریندار بوونی کۆئەندامی میز». هەروەها بەتاڵ کردنی میزڵدانێکی بەتین هەڵئاوسابێ، نابێ بەیەک جارو کت و پڕ بەتاڵ بکرێت چونکە بەخێرا بەتاڵ کردن دەبێتە هۆی خوێن بەربوون و سەرباری خراپی دی. بۆیە لەسەرەتادا ٣٠٠مل بەتاڵ دەکرێ، ئینجا هەر چارەگێک ١٠٠ مل بەتاڵ دەکرێت.

**قەستەرەی میزڵدان بۆ ئافرەت:**

هەردوولاقی نەخۆشەکە بەتەواویی دەکرێنەوەو ئەژنۆکانی دەنوشتێنەوە. ئنجا هەمان تەکنیکی قەستەرەی پیاوان ئەنجام دەدرێت.

جۆرەکانی سۆندەی قەستەرە: (وێنە 10-1,2)

Fig. 10-1. straight French catheter.

Fig. 10 -2. Coude catheter.

## دەرکێشانی میز بەشێوەیەکی بەردەوام

## «Continuous drainage»

Fig. 10-3. Foley catheter.

بۆ ئەو مەبەستە قەستەرەی لەجۆری «Foley» ژمارە «١٨» بەکاردەهێنرێ کە باڵۆنێکی ١٠ مل لەنزیک لووتکەیەوە چەسپ کراوە. (وێنە 10-3) بەجۆرێک مسۆگەری ئەوە بکە کە باڵۆنەکە لەبۆری میزدا نەمێنێتەوە بەڵکو دەبێ بگاتە میزڵدانی نەخۆشەکە. ئنجا ٨ مل گیراوەی خوێی سروشتیی بەهۆی سرنجێکەوە ئاراستەی ناو باڵۆنەکە بکە. ئەو جۆرە قەستەرە نوێیانەی کە لەماددەی سیلاستیک «Silastic»ی نەرم دروست کراون، ئازاری بۆری میز کەمتر دەکەنەوە.

## قەستەرەی نالەبار

«Difficult cathererization»

ئەگەر هاتو تەکنیکی قەستەرەکردنی میزڵدان زەحمەت بوو، پەیرەوی ئەو خاڵانە بکە:
١- مسۆگەری ئەوە بکە کە قەستەرەکە باش چەورکرابێ و دیسان هەوڵی لەگەڵ بدەوە.
٢-«٥-١٠» مل لەماددەی نەرم کەرەوەی موعەقەم بەهۆی سرنجێکەوە ئاراستەی کونی میز بکە. ٣- ئەگەر نا قەستەرەی جۆری کۆد «Coude» بەکاربهێنە (وێنە 10-2) ٤- ئەگەر نا پێویستە لەسەرووی ناوچەی «عانە» وە پێست کون بکرێ و نیدلێکی گەورە بخرێتە میزڵدانەوە. ئەمەش تەنها لەو کاتەی کە رێگای قەستەرەی ئاسایی لەتوانادا تەبێت و میزڵدانیش هەڵئاوسابێت یاخود بەدەست هەست بەمیزڵدان بکرێت. بەڵام لەدوو حالەتدا نابێ ئەم کارە ئەنجام بدرێت: ١- ئەگەر هاتو شێوەی میزڵدان شێوابێت Bladder ab-normalities. ٢- میزە خوێن «Haematuria». دەرکێشانی میز بەرێگای چوارەم پێی دەووترێ کون کردنی میزڵدان لەرێگای پێستەوە لەناوچەی سەرووی «عانە»وە «Pericutaneous suprapubic cystostomy».

**ئەم تەکنیکەش بەم هەنگاوانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:**

١- ناوچەی سەرەوەی «عانە» ئامادە بکە. ٢- رێگا خۆشکەرێکی بچوک Small tro-car لەگەڵ کانیولایەک یاخود لەگەڵ نیدلێکی گەورەی ژمارە «١٤» لەسەرهێڵی ناوەڕاستی سک و ٢ سم لەسەرەوەی ئێسکی «عانە»دا بەرێگای پێستەوە دەخرێتە ناو حەوز بەئاراستەی کلێنجە «Coccyx» ی نەخۆشەکە.

٣- کاتێ کە گەیشتە میزڵدان ترۆکارەکە دەربکێشە دەرەوەو قەستەرەیەکی بچوک بەنێو کانیولاکە یاخود نیدلە گەورەکەدا ئاراستەی ناو میزڵدان بکە.

٤- دوای ئەوە کانیولاکە یاخود نیدلەکە دەربهێنە دەرەوە.

٥- قەستەرەکە بەسکەوە بلکێنە و بەدەزگای دەرکێشانی میزەوە چەسپی بکە.

دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە ئەو تەکنیکە مەترسیی هەوکردنێکی زۆری لێ دەکرێت، بۆیە رێگای تەعقیمی تەواو لەئامێرو لەکاتی کارکردندا رەچاوبکرێت و هەرچەند لە توانادا هەبێت، دەبێ بەزووترین کات، قەستەرەکە دەربهێنرێت. هەروەها پێویستە ئەو تەکنیکە لەلایەن پزیشکێکی کارامەوە ئەنجام بدرێت وێنە (10-4).

**Fig. 10-4.** Bladder catheterization via percutaneous cystostomy.

# چەسپ کردنی سۆندەی گەدەو ریخۆڵە

«Gastrointestinal intubation»

بریتیـیە لە خستنە ژوورەوەی تیوبی گەدە یاخود ریخۆڵە، کە نەخۆش و پزیشکی پێ نارەحەت دەبێت.

**مەبەستەکان:**

١- ناسـینەوەی نەخـۆشـیی «Diagnosis»: هەروەک ناسـینەوەی خـوێن بەربوون «Bleeding» لەبەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەرس.

٢- دەرکێشان«Lavage»: هەروەک لەکاتی گومان کردن لە قووتدانی شتێک. یاخود بۆ پشکنینی شلەمەنی گەدە، هەروەها دەرکێشانی ئەو ژەهرانەی کە لە جۆری سووتەمەنی نەبن.

٣- بۆ نەهێشتنی هێلنج و رشانەوەی نەخۆش.

٤- بـۆ کەم کـردنەوەی پاڵەپەستۆ یـاخود فـراوان کـردنەوەی کۆئەندامی هەرس «بۆ نموونە لەکاتی داخسـتنی دەرچەی خـوارەوەی گـەدە «Pyloric obstruction»، شـەلەلی ریخـۆڵە، دوای نەشتەرگەریی. هەروەها لەکاتی هەناسە بەخشینی میکانیکیی».

٥- بەخشینی خۆراک «Feeding».

Fig. 11-1. Sump tube.

## بۆری (سۆندە)ی لووت بۆ گەدە بۆ ماوەیەکی کورت

«Short nasogastric tube»

بریتـیـە لەو جـۆرە بۆریەی کـە بەشـێـوەیەکی سـەرەتایی بۆ بەتاڵ کـردنی گـەدە «Stomach» بەکاردەهێنرێ. چەشنەکانی بریتین لەوانەی خوارەوە:

١- بۆری گـەورە بۆ دەرکێشـانی شلە لەگەدەوە «Ewald tube»: بەتایبـەتی بۆ مـەبەسـتی لابردنی خـوێنی مـەیـیو «لەئەنجامی خوێنبـەربوونی گەدەوە» بەکاردێت ئەم چەشنە لەرێگای دەمەوە دەخرێتە ناو گەدەو بەهۆی گەورەیی قەبارەکەیەوە بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێت.

٢- تاکـە بۆری ئاسـایی «Levin tube» کـە لەلاستیک یاخود پلاستیک دروست کراوە. نەخۆش بەرگەی جۆری پلاستیک زیاتر دەگرێ وەک لەجۆری

Fig. 11-2. Method of inserting nasogastric tube.

لاستیک چونکە جۆرەکەی کۆتایی دەبێتە هۆی داڕووشان «Irritation». قەبارەی ئەم جۆرەیان «١٤»یەو تیرەکەی «٥» ملم دەبێت. ناوە ناوە پێویست بە هەڵمژین دەکات «Suction» یاخود بەرێگای هێزی راکێشانی زەمین، پێویست بەدەرکێشان دەکات. چونکە فشاری نێگەتیڤی جێگیر دەبێتە هۆی مژتنی لینجە شلە «Mucus»ی گەدە بەرەو کونی چوونە ژوورەوەی بۆڕیەکە، لەئەنجامدا زیان بە ناوپۆشی گەدە دەگات.

٣- ئەو جۆرە بۆڕییەی کە بەرگی هەیە «Sump tube»: لەپلاستیک دروست کراوە دوو لووی هەیە. بەچەشنێک بۆڕیەکەی دووەم کە بچوکە، رێگای چوونە ژوورەوەی هەوا دەدات. ئەم جۆرە لەگەڵ هەڵمژینی جێگیر «Constant suction» بەکاردەهێنرێ، چونکە هەوا لە بۆڕیچکەکەدا دێتە خوارەوە ناهێڵێ بۆڕیەکە بگیرێ یاخود زیان بە لینجە شلەی گەدە بگات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار دووچاری گیران دەبێت «block» (وێنە 11-1,2)

## تەکنیکی چەسپ کردنی بۆڕی لووت بۆ گەدە

١- تەکنیکەکە بۆ نەخۆشەکە راڤەبکەو دڵی بدەرەوە. ٢- درێژیی بۆڕیەکە بپێوە. پێوانەکەش بەجۆرێک دەبێ کە لەپردی لووتی «Nose bridge» نەخۆشەکەوە دەست پێ بکەیت تا وەکو شلکەی گوێ «نەرمە گۆشتی گوێ» «Earlobe» ئنجا درێژی بۆڕیەکە کۆبکەوە لەگەڵ درێژیی ماوەی نێوان سەری لووت تاوەکو دەگاتە کۆتایی زیادە ئێسکی خوارەوەی کوڵەی سنگ «Xyphoid process». ٢- پارچە مەندیلی کاغەزو قاپێکی ڕشانەوە ئامادە بکە. ٣- بەدرێژایی «٤» ئینج و بەهۆی جۆرە ماددەیەکی نەرم کەرەوە «کە توانای توانەوەی ناو ئاوی هەبێت»، کۆتایی بۆڕیەکە چەور بکە. ٤- بەهێواشیی بۆڕیەکە بەرێگای کونەلووتەوە ئاراستەی قوڕگی نەخۆشەکە بکە. لەم کاتەدا نەخۆشەکە کۆخە دەکات و فرمێسک لەچاوانی دێت. ٥- نزیکەی «١» ئینج بۆڕیەکە ڕاکێشە دەرەوەو نەخۆشەکە هان بدە بۆ ئەوەی خاو بێتەوە ئنجا بۆڕیەکە بەکەمترین هێزەوە پاڵ بدەو ئاراستەی ژوورەوەی بکە. ئەگەر رێگای بۆڕیەکە گیرا، بیسوڕێنە. بەڵام ئەگەر هاتو هەرتێپەڕ نەبو نەکەی بەهێزەوە پاڵی بدەیت. بەڵکو بۆڕیەکە بگوازەوە بۆ کونە لووتەکەی دی. ٦- ماوەی نەخۆشەکە بدە خاوبێتەوەو داوای لێ بکە چەند جارێک قووت بدات و هەندێ ئاوی بدەرێ

بەڕێگای لوولەیەکی لەکاغەز دروست کراو، بۆ ئەوەی چەند قومێکی بچوک لەئاو بخواتەوە. ئەگەر هاتو نەخۆشەکە زۆر تێک بچێت و تووشی کۆخەی بەتین و هێڵنج هاتنێکی بەتین بێت، ئەوە دەگەیەنێ کە بۆڕیەکە لەناو سورێنچکدا چەماوەتەوە بەرەو سەرەوە. لەوکاتەدا سەری بۆڕیەکە ڕابکێشەوە بۆ ناوچەی لووتەگەرووی «Naso pharynx» نەخۆشەکە. دیسانەوە ماوەی بدە کەمێک پشوویدات. ویزەی هەناسە یاخود هەناسە بڕکێی نەخۆشەکە، ئەوە دەردەخات کە بۆڕیەکە بەشێوەیەکی هەڵە چووەتە ناو بۆڕی هەناسەوە.

## لە چ کاتێکدا نابێ تەکنیکی بۆڕی لووت بۆ گەدە ئەنجام بدرێت؟

ئەگەر هاتو بنکەی لووت «Cribiform plate» بەلای کەللەی سەرەوە تووشی شکان بووبێت، بۆڕی لووت بەشێوەیەکی هەڵە دەچێتە ناو کەللەی سەرەوە. ئەمەش نابێت. بۆیە لەکاتی شکانێکی بەتین لەناوچەی ڕووی نەخۆشدا، پێویستە بۆڕی گەدە بەنێو دەمدا تێپەڕ بکرێت نەک بەڕێگای لووتەوە.

پشکنینی بۆڕی لووت بۆ گەدە بۆ ئەوەی بزانین ئایا بەچاکیی کاردەکات، ئەمە بەدووڕێگا ئەنجام دەدرێت: أ- بەهۆی هەڵکێشانی پێکهاتوەکانی ناو گەدە. ب- بەهۆی سرنجێکەوە ٥-١٠ مل لەهەوا ئاراستەی ناو بۆڕیەکە بکە. ئنجا بیستەکی پزیشکیی «Stethescope» لەسەر ناوچەی گەدە دابنێ، بیستنی دەنگی بلقی هەوا «Gargle» بۆمان دەردەخات کە بۆڕیەکە لەناو گەدەیە.

Fig. 11-3. Method used for securing nasogastric tube. Too tight a curve can cause pressure necrosis of the nares.

٧- بۆڕیەکە بەهۆی سارغی‌یەوە «Plaster» لەسەر ڕوومەت و لەنزیک کونە لووتەوە چەسپ بکە. بەڵام زۆر قوچاندنەوەی بۆڕیەکە، پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر کونە لووت و دەبێتە هۆی مردنی شانەکانی ئەوناوچەیە. لەکاتی گواستنەوەی نەخۆشەکەدا، لەتواناداهەیە بۆڕیەکە لەملی نەخۆشەکە چەسپ بکرێت بۆ ئەوەی زۆر نەجوولێتەوە (وێنە11-3)

## چۆنیەتی گرنگی دان بە بۆڕی لووت بۆ گەدە

١- هەر «١-٢» کاتژمێر جارێک بۆڕیەکە بەهۆی ٣٠ مل گیراوەی خوێی سروشتی «N.S» تەڕبکە. هەرکاتێک بۆڕیەکە بگیرێت، بەهۆی تێپەڕکردنی ٢٠مل لەهەوا، دەکرێتەوە. ٢- هێندی ئایۆنە کارەبایی‌یەکان «Electrolytes» لەجۆری وەرگیراوو لەجۆری

دەرچوو کۆنترۆل بکە بەمەبەستی قەرەبۆکردنیان. هەروەها ئەم کارە چۆنیەتی کارکردنی بۆریەکەش دەردەخات. ٣- پێویستە گرنگیەکی چاک بە پاک و خاوێنیی ناو دەمی نەخۆشەکە بدرێت، بۆ قەدەغەکردنی هەوکردنی گلاندەکانی لیک «Parotid gland». ئەگەر هاتو نەخۆشەکە رێگای پێ درابو، با پارچە بەفر بمژێ. ٤- ئەگەر ناو قورگی نەخۆشەکە زۆر داڕووشابو، پێویستە غەرغەرە بەشلەیەکی سڕکەر، واتە لیدۆکەین «زایلۆکاین»بکات. ٥- هەوکردنی گوێ بەهۆی نەوجۆرە قەترەیە «Drop» قەدەغەبکە کە سوک و ئاساییە و دژ بە سوورهەڵگەڕانی ناو لووتە «Mild nasal decongestant». چونکە داڕووشانی کەناڵی ئۆستاکیی لەناوچەی بۆشایی لووت بۆ گەروو، دەبێتە هۆی داخستنی ناوچەکە. ٦- دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە بۆری لووت بۆ گەدە دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەو دیاردە خراپانەی خوارەوە:

أ- داڕووشانی ناوپۆشی گەدە «Irritation of gastric mucosa». ب- خوێن بەربوون «Bleeding». ج- بێ توانا بوونی ماسولکەی گوشەری دەرچەی گەدە «Sphinicter incompetent». د- هەوکردنی سورێنچک لەئەنجامی گەڕانەوەی پێکهاتوەکانی ناو گەدە بۆ سەرەوە «Reflux oesophagitis». لەبەر ئەو چوار دیاردەیە پێویستە گرنگییەکی چاک بەو نەخۆشە بدرێت کە بۆری لووت بۆ گەدەی بۆ چەسپ کرابێ.

## بۆریە درێژەکانی کۆئەندامی هەرس

## «Long gastrointestinal tubes»

بۆریە درێژەکانی ریخۆڵە بەشێوەیەکی سەرەتایی بۆ کردنەوەی ریخۆڵە بەکاردەهێنرێن. هەندێ جاریش بۆ شوێنی خوێن بەربوونی ریخۆڵە بەکار دەهێنرێ. بەهۆی یارمەتی جوولەی شێوە کرم «Peristalsis»ی ریخۆڵەوە ئەم جۆرە بۆریە بەرەو ریخۆڵە تێپەڕ دەبێت. بۆیە ئەم جۆرە بۆریانە سوودمەند نین بۆ ئەو نەخۆشانەی کەجوولەی ریخۆڵەیان چالاک نەبێت.

**چەسپکردنی بۆری ریخۆڵە:**

بۆچەسپکردنی بۆری ڕیخۆڵە، جوولەی شێوەکرم و هێزی ڕاکێشانی زەمین یاریدەی تێپەڕبوونی بۆریەکە دەدەن بەرەو دەرچەی خوارەوەی گەدە «Pylorus» و بەشێوەیەکی گشتیی بەرەو کۆئەندامی هەرس. ئەگەر لەتوانادا هەبوو پێویستە بۆریەکە هاوکات لەگەڵ ڕوانینی ڕەنگین «Flouroscopy» تێپەڕبکرێت. دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە بۆری ڕیخۆڵە تێپەڕنابێت، ئەگەر هاتو سەرەکەی لەبەشی لووتکەی چەماوەی «Fundus» گەدە گیربخوات. پێویستە نەخۆشەکە لەباری نیمچە دانیشتن بێت «Semifowler's position» وبەرەو لای ڕاست خۆی بچەمێنێتەوە یاخود لەسەر تەنیشتی لای ڕاست بێت «Right decubitus position». کاتێک بۆری ریخۆڵە لەدەرچەی خوارەوەی گەدەوە بچێتە خوارەوە، بەهۆی جوولەی کرمۆڵەیی‌یەوە بۆریەکە خۆی بەرەو ریخۆڵە باریکە دەچێتە خوارەوە. بۆیە لەم هەنگاوەدا نابێ بۆریەکە بەهۆی سارغی‌یەوە لەلووتی نەخۆشەکە چەسپ

بکرێت چونکە هێشتا جوولەی ماوە. باشترین ڕێگاش بۆ سەلماندنی چەسپ کردنێکی سەرکەوتووانەی بۆڕی ریخۆڵە بریتیە لە وێنەی تیشکی ئێکس «X ray».

### چۆنیەتی گرنگی دان بە بۆڕیە درێژەکان «Care of long tubes»

پێویستە هەروەک بۆڕی لووت بۆ گەدە گرنگیی بە بۆڕی ریخۆڵە بدرێت دەتوانرێ هەمان بۆڕی بەکاربهێنرێت بەجۆرێک کە وەکو فتیلە توانای بەرزو نزم بوونەوەی هەیە. بەڵام پێویستە زۆر زیاتر گرنگیی بەپاک و خاوێنیی بۆڕی ریخۆڵە بدرێت. ڕێگا بە بۆڕی درێژ بدە بۆ ئەوەی پێش بکەوێ تاوەکو دەگاتە خاڵێکی داخراو. کاتێ کە هەوڵی کردنەوەی ئەو خاڵە داخراوە دەدەیت، یەکسەر بۆڕیەکە ڕێڕەوی کۆئەندامی هەرس دەگرێت و یەکسەر نەخۆشەکە غازات فڕێ دەداتە دەرەوەو ریخۆڵەی جوولە دەکات و لەوانەیە پاشەڕۆ فڕێ بداتە دەرەوە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە دەبێ لەم هەنگاوەدا بۆڕیەکە ڕابگیرێت و بەلووتی نەخۆشەکە چەسپ بکرێت.

### چۆنیەتی دەرهێنانی بۆڕیە درێژەکان «Removal of long tubes»

ئەو جۆرە بۆڕیە پێویستە بەهێواشیی و هەنگاو بەهەنگاو دەربهێنرێ. لەسەرەتادا «٨-١٢» ئینجی بۆڕیەکە ڕابکێشەو بۆ ماوەی «١٢» کاتژمێر بەتوندیی لەلووتی نەخۆشەکە چەسپی بکە. ئنجا دوای «١٢» کاتژمێر دیسانەوە ڕایکێشە دەرەوە. ئەم کارە دووبارە بکەوە. تاوەکو لووتکەی بۆڕیەکە دەگاتە گەدەی نەخۆشەکە. دوای ئەوە بەتەواویی ڕایکێشە دەرەوە. بەجۆرێک ئەو دەرکێشانە هەنگاو بەهەنگاوە ماوە نادات بۆڕیەکە لەناو ریخۆڵەدا گیر بخوات. بەڵام ئەگەر هاتو بۆڕیەکە لەزمانەی ژێرەوەی پێکەوە لکان «Ileocecal valve» تێپەڕیوو بو، زەحمەتیش بوو بەڕێگای لووتەوە دەربهێنرێ، بۆڕیەکە لە لووتەوە بپچڕێنەو وازی لێ بێنە تاوەکو خۆی بە شێوەیەکی سروشتیی لەڕێگای کۆمەوە دەردەچێتە دەرەوە.

## بۆڕی بەخشینی خۆراک

## «Feeding tube»

ئەم تەکنیکە بۆ نەخۆشێک ئەنجام دەدرێت کە لەتوانایدا نەبێت ڕادەیەکی پێویست لەخواردن بخوات. بەمەرجێک دەبێ جوولەی ریخۆڵەو کاری ریخۆڵەی سروشتیی بێت.

**هەنگاوەکان:**

١- بۆڕیەکی ژمارە «٨-١٢» بەکاربهێنە کە لووتکەکەی بە جیوە قورس کرابێ بۆ ئەوەی نەخۆشەکە بەرەو گەدە یاخود ریخۆڵە قووتی بدات. ٢- بۆڕیەکە بەکەمێک «جەلی» «Jelly» چەوربکە کە توانای لەناو توانەوەی هەبێت. ٣- بۆڕیەکە بخەرە ناو لووتی

نەخۆشەکەو داوای لێ بکە کە قووتی بدات چونکە بۆڕیەکە زۆر نەرمەو بەئاسانیی بەناو کۆئەندامی هەرسدا تێپەڕ دەبێت. ٤- شوێنی لووتکەی بۆڕیەکە بەهۆی پالْدانی نەختێ هەواو بەکارهێنانی بیستەر دیاری بکە. ٥- ئەگەر هاتو بۆڕیەکە ئاراستەی ڕیخۆڵە بکرێت، نەخۆشەکە لەسەر تەنیشتی ڕاستەیدا درێژ بکە بۆ ئەوەی بەئاسانیی بە نێو دوانزەگرێ «Duodenum»دا تێپەڕبێت. ٦- وێنەی تیشکی ئێکس گرنگە بۆ دیارکردنی دوایین شوێنەواری بۆڕیەکە.

## پارێزگاری کردنی هەناسەدان

**«Airway maintenance»**

لەزەمانی کۆندا ئەگەر هاتو نەخۆشێک توانای هەناسەدانی نەبوایە، لەمەرگەساتی نزیک دەکردەوە، هەندێ جار پزیشکەکان بۆڕی هەناسەیان کون دەکرد «Tracheostomy» بەلاّم دەبوایە نەخۆشەکە خۆی توانای هەناسەدانی هەبوایە. دوای ئەوەی سڕکردن واتە بەنج کردنی نەخۆش هاتە کایەوە، بەکارهێنانی تیوبی بۆڕی هەناسە «Endotracheal intubation» هاتە کایەوە. هەروەها چارەسەرکردنی ئیفلیجیی تەکنیکی هەوا بەخشینی بەدوادا هات. تاقی کردنەوەی زانینی قەبارەی هەوا بەخشین «Volume cycled ventilation» سوودێکی وای بەئێمە بەخشی کەتەنانەت ئەگەر هاتو سیەکانی نەخۆشێک بۆ ماوەیەکی کەم خایەن پەکیشیان کەوتبێ «Acute failure» ، نەخۆش بەزیندویی بمێنێتەوە.

## هەوا ڕێچکەی گەرو

**«Phargngeal airway»**

لەئەنجامی بوورانەوە بەهۆی کارەساتەکانەوە، زمانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە دواوە بۆ ناوچەی هاوبەشی دەم و گەرو «Oropharyhx». بۆیە هەوارێچکەی گەرو لەناوچەی ناو دەم و ناوچەی هاوبەشی دەم و گەرودا چەسپ دەکرێت. ئەمەش بەپێویستی پالْپشت کردنی زمان و قەدەغەکردنی داخستنی ڕێڕەوی هەوا ئەنجام دەدرێت. بەزۆریی هاوڕێک لەگەلْ تیوبێکی بۆڕی هەناسە بەکاردەهێنرێ کەچی لەکاتی فریاکەوتندا خۆی لەخۆیدا ڕزگارکەری ژیانە.

## چەسپ کردنی تیوبی دەم بۆ بۆڕی هەناسە

**«Orotracheal intubation»**

ئەم تەکنیکە لەکاتی سڕکردنی گشتیدا بەکاردێت. تیوبی بۆڕی هەناسە فراوان بونەوەیەکی لەشێوەی بالۆن لەکۆتاییەکەیدا هەیە بۆئەوەی لەڕێڕەوی هەناسەدا جێگیربێت. ئەم فراوان بوونەوەیەش پێی دەووترێ بالۆنی پالەپەستۆ نزم «Low pressure cuff» . بەجۆرێک کە هەرکاتێک بالۆنەکە پڕ هەوابکرێت، گەلێک لەبۆڕی هەناسە گەورەتر دەبێت.

کەچی ئەگەر هاتو بەشێکی باڵۆنەکە هەوای تێ بکرێت بەمەبەستی داپۆشین کردنی باڵەپەستۆیەکی نیمچە نزم، هێشتا باڵۆنەکە هەر لەبۆری هەناسەدا گیر دەبێت. بەڵام باڵۆنەکە دەبێتە هۆی داڕووشانی لینجە پەردەی بۆری هەناسە. بەجۆرێک ئەگەر هاتو باڵەپەستۆی باڵۆنەکە نزم بێت، زیانەکەی کەمتر دەبێت. بەکارهێنانی ئەو باڵۆنە بۆ منداڵی شیرخۆر «Infant» پێویست ناکات. چونکە نەرمەشانەی ژێرەوەی گەرو بەیەکەوە لەگەڵ قوڕگ «Larynx» ڕێگای هەوا لەدەوروبەری تیوبەکەدا دەگرن.

### جۆرەکانی تیوبی بۆری هەناسە ,Types of endotracheal tubes,

جۆرەکانی تیوبی بۆری هەناسە لە (وێنە 12-1)دا ڕوون کراونەتەوەو بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- تیوبی بۆری هەناسە بۆ گەوران «Adult endotracheal tube».

٢- تیوبی بۆری هەناسە بۆ شیرخۆر «Infant endotracheal ، be».

٣- هەوا ڕێچکەی گەرو «Pharyngeal airway».

Fig. 12-1. Endotracheal tubes. A, Adult. B, Infant. C, Pharyngeal airway.

### جۆرەکانی ڕووانینی قوڕگ ,Types of Laryngoscopy,

١- ڕووانینی قوڕگ لەجۆری نوک پەلی چەماوە «Curved blade laryngoscope» (وێنە 12-2).

٢- ڕووانینی قوڕگ لەجۆری نوک پەلی ڕاست و ڕێک 'Straght blade laryngo-scope'' (وێنە 12-3)

پزیشکە سڕکارەکان جۆری چەماوەی نوک پەل پەسند دەکەن. بەڵام لای پزیشکانی دی بەکارهێنانی جۆری ڕێک ئاسانترە. بڕوانە (وێنە 12-4) کەچەسپ کردنی تیوبی هەناسە بەڕووی نەخۆشەکەوە ڕوون دەکاتەوە.

**Fig. 12-2. A**, Curved blade technique. **B**, Placement of tube with curved blade laryngoscope.

Fig. 12-3. Straight blade technique.

Fig. 12-4. Endotracheal tube in place, with pharyngeal airway, showing details of securing the tube and airway with adhesive tape.

## چەسپ کردنی تیوبی بۆڕی هەناسە هاوڕێک لەگەڵ

## ڕووانینی قوڕگ «Laryngoscopy» لەجۆری چەماوە

ئەم تەکنیکە بریتییە لەچەسپ کردنی جۆری ژمارە «١» لەجۆرەکانی ڕووانینی قوڕگ هاوڕێک لەگەڵ هەریەکێک لەسێ جۆرەکەی تیوبی بۆڕی هەناسە. چونکە بەکارهێنانی ئامێری ڕووانینی قوڕگ یارمەتی چوونە ژوورەوەی تیوبی بۆڕی هەناسە دەدات. ئەویش بەپەیڕەوی کردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:

١- لووتکە خڕەکەی ئامێری ڕووانینی قوڕگ ئاڕاستەی بەشی خوارەوەی گەرو بکە. بە جۆرێک بکەوێتە سەر بنکەی زمان ڕێک و ڕاست لەپێشەوەی زمانە بچکۆڵە.
٢-بەشێوەیەکی ڕێک ئامێرەکە بەرزبکەرەوە بۆ ڕاکێشان و دوورکەوتنەوەی زمان لەڕێڕەوی هەناسە. بەدرێژایی ئامێرەکە سەیرێکی خوارەوە بکە کە لە توانادا هەیە زمانە بچکۆڵە ببینرێ، هەروەها لەتوانادا هەیە کرکراگەی ئەریتینۆید ببینرێ. ٣- تیوبی بۆڕی هەناسە بەگوێرەی تەمەنی نەخۆشەکە بێنەو ڕێک لەگەڵ نووکی ئامێری ڕووانینی قوڕگدا تێپەری بکە. بەمەرجێک لووتکەی تیوبەکە بکەوێتە بەشی پێشەوەی کرکراگەی ئەریتینۆید و بەنێو تاڵەکانی دەنگەوە «Vocal cord» بەرەو بۆڕی هەناسە بڕوات. ڕێڕەوی تیوبەکە بەهۆی میتاڵی ئامێری ڕووانینەوە دەکرێتەوە. چونکە تیوبی پلاستیکیی نەرم دەچەمێتەوە. هەروەها میتاڵەکە یارمەتی ئاڕاستەکردنی تیوبەکە دەدات بەنێو تاڵەکانی دەنگەوە. هەندێ جار تاڵەکانی دەنگ بەتوندیی دادەخرێن. ئەمەش دەبێتە هۆی کورژبوونەوەی قوڕگ «Laryngospasm» هەر کاتێک ئەم دیاردەیە ڕوویدات، بەهێواشیی تیوبەکە بەرەو سەرەوەو دژ بەتاڵەکانی دەنگ ئاڕاستە بکەو کۆتاییە باریکەکەی بەکاربهێنە بۆ تێهەڵکێشانی بەنێو تاڵەکانی دەنگەوە. بەڵام ئاگادار بە پاڵەپەستۆیەکی بەهێز دەبێتە هۆی ئازارگەیاندن بە کرکراگەی ئەریتینۆید.

## چەسپ کردنی تیوبی بۆڕی هەناسە هاوڕێک

## لەگەڵ ئامێری ڕووانینی قوڕگ لەجۆری ڕاست و ڕێک

ئەم تەکنیکە بریتییە لە چەسپ کردنی هەریەکێک لەجۆرەکانی تیوبی بۆڕی هەناسە «Endotracheal tube» بەیارمەتی ئامێری ڕووانینی قوڕگ لەجۆری ڕاست «Straight blade laryngoscope» نەک جۆری چەماوە کە لەسەرەوە باسمان کرد. هەنگاوەکانی ئەم تەکنیکەش بریتین لە:

١- بەهۆی نووکی ئامێری ڕووانینەوە زمانە بچکۆلە بەرز بکەوە. بەم جۆرە لەتوانادا هەیە تاڵەکانی دەنگ ببینرێن. ٢- تیوبێک بەگوێرەی تەمەنی نەخۆشەکە هەڵبژێرەو هاوڕێک لەگەڵ ئامێرەکەدا ئاڕاستەی قوڕگی نەخۆشەکەی بکە. بەڵام دوای ئەوەی کە تیوبەکە بەرەو قوڕگ ئاڕاستە دەکرێت، تاڵەکانی دەنگ لەبەرچاوت وون دەبن. کەچی فێر

بوونی تەکنیکی ئەو ئیشە لەبەرکارهێنانی ئامێری رووانینی چەماوە ئاسانترە. ٣- پاش تێپەڕکردنی تیوبەکە بەرەو قوڕگ. تیوبەکە توند بەدەستێک بگرەو بەدەستەکەی دی ئامێری رووانین دەربهێنە دەرەوە. ٤- ڕێرەوی هەناسەی گەرو «Pharyngeal airway» چەسپ بکە بەمەبەستی گازنەگرتن لە تیوبی بۆڕی هەناسە. ٥- تیوبەکە بەهۆی سارغی‌یەوە لەشوێنی خۆیدا چەسپ بکە.

## چەسپ کردنی بۆڕی لووت بۆ هەناسە «Nasotracheal Intubation»

ئەم تەکنیکە زۆر جیاوازە لەگەڵ چەسپ کردنی بۆڕی دەم بەرەو بۆڕی هەناسە. تەنها بۆ ئەو کەسانەش بەکاردەهێنرێ کە جارجار تووشی هەناسەتەنگیی دەبن. دوای چەورکردنی بۆڕیەکی ژمارە (٧) لەگەڵ کونە لووتی نەخۆشەکە بەهۆی مادەی سڕکەری زایلۆکاین بەشێوەی جەلی (Jelly)، ئنجا درێژی بۆڕیەکە بەدووری نێوان سەری لووت و نەرمایی گوێ نیشان دەکرێت و بۆڕیەکە بەدیوی خوارەوەی کونە لوتەوە تێپەڕ دەکرێت ئنجا بەرەو گەروو قوڕگ. کاتی کە بۆڕیەکە دەگاتە بەشی نیشانەکراو، سەری بۆڕیەکە لەبەشی خوارەوەی قورگ جێگیر دەبێت. ئنجا بەهێواشی و بەسووکە پاڵەپەستۆیەکەوە بۆڕیەکە پاڵ بدە تاوەکو بەچاکیی هەناسەی نەخۆشەکە لەکونی بۆڕیەکەوە بیستراو دەبێت. بەردەوامبە لەسەر پاڵدانی بۆڕیەکە بۆ ژوورەوەو بەنێو ژێیەکانی دەنگەوە. ئەگەر هاتو بۆڕیەکە تێبەڕ نەبێت و بوەستێ، هەڵی بکێشە دەرەوەو دیسانەوە هەوڵ بدەرەوە. بەڵام ئەگەر هاتو هەوڵەکان بێ سوود بوون و نەخۆشەکەش لەهۆش خۆی چوو، ئامێری نۆڕینی قورگ «Laryngoscope» بەکاربهێنە بۆ بینینی قورگی نەخۆشەکە و بۆڕیەکەش بەهۆی گیرەی رۆبنسن «Robinson forceps» بخەرە نێو قورگەوە. باشترین لایەنە چاکەکانی بۆڕی لووت بۆ هەناسە ئەوەیە کە نەخۆشە بەخەبەرەکان بەشێوەیەکی چاک بەرگەی دەگرن. کەچی گەورەترین گیروگرفتی ئەو ڕێگایە ئەوەیە کە بۆڕیەکە بەئاسانی دەگیرێت ئەمەش لەبەر ئەوەی بۆڕیەکە درێژو باریکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باشترین ڕێرەوی هەناسەدانە بۆ نەخۆشێکی بەئاگا یاخود نیمچە ئاگا
(وێنە 12-5).

Fig. 12-5. Nasotracheal intubation.

## کون کردنی بۆڕی هەناسە

«Tracheostomy»

بریتیە لە کون کردنی بۆڕی هەناسە لە ناوچەی کرکراگەی دەرەقیەوە بۆ ماوەیەکی کاتیی و فریاکەوتنی خنکانی نەخۆش کە پێی دەووترێ تەکنیکی «Cricothyroidotoy» (وێنە 12-6) یاخود بە بەردەوامیی تیوبی بۆڕی هەناسە دەخرێتە ناوچەی خاڵی سەرەوەی ئێسکی کۆڵەی سنگ کە پێی دەووترێ تەکنیکی «Low Tracheostomy» (وێنە 12-7) مەبەستەکانی ئەنجامدانی تەکنیکی کون کردنی بۆڕی هەناسە ئەمانەن:

١- ئەم تەکنیکە بۆ ئەو نەخۆشانە ئەنجام دەدرێت کە بۆ ماوەی «١-٢» هەفتە پێویستیان بە هەوا بەخشین هەیە. یاخود ئەوانەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەهۆش خۆیان چووینە. چونکە کون کردنی بۆڕی هەناسە لای نەخۆشەکە خۆشترو ئاسانترە لە هێشتنەوەی تیوبی بۆڕی هەناسە بۆ ماوەیەکی درێژ.

٢- کرداری هەڵمژینی شلە «Suctioning»و کۆخە «Cough» لەو نەخۆشانەی کە ئەم تەکنیکەیان بۆ دەکرێت، کاریگەرترە. چونکە کون کردنی بۆڕی هەناسەو چەسپ کردنی تیوبێکی کورت و فراوان زیاتر یارمەتی دەرچونی شلەو کۆخە کردن دەدات. بەتایبەتی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە شلەیەکی زۆر لەبۆڕی و بۆڕیچکەی هەناسەیاندا دەردەچێت.

٣- داخرانی «گیرانی» قورگ پێویست بەم تەکنیکە دەکات. چونکە دوای چوار دەقیقە لە وەستانی هەناسەدان زیانی گەورە بە مێشک دەگات.

خاڵێکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە کون کردنی بۆڕی هەناسە تەنها لەو کاتەدا دەکرێت کە بەخشینی هەوا بە هۆی توورەگە «Bag» و دەمامک «Mask»ـەوە مەحاڵ بێت. یەکەم جار ڕێرەوی واتە ڕێچکە هەوای گەرو «Pharyngeal airway» بۆ نەخۆشەکە چەسپ دەکرێت. دووەم جار تیوبی بۆڕی هەناسە «Endotracheal tube» ئینجا ئەگەر هاتو یەکەم و دووەم سوودیان نەبو، ئەوجا سێیەم جار لەوکاتەیکە تیوبی بۆڕی هەوا هێشتا هەر لەجێگای خۆی بێت، ئەوجار بۆڕی هەناسەی نەخۆشەکە کون دەکرێت. تەنانەت لەکاتی داخرانی قورگیشدا «Laryngeal obstruction» واچاکە بەهۆی نیدلەوە کرکرەی مل کون بکرێت هاوکات لەگەڵ هەوا بەخشینی لەچەشنی «نافورە». ئەمەش لەبەکارهێنانی چەقۆ زیاتر پەسند دەکرێت.

## ئەو حاڵەتانەی کە نابێ بۆڕی هەناسە کون بکرێت

«Contraindications of tracheostomy»

١- لەکاتی سووتاندا «Burns»: تەنانەت ئەگەر هاتو پێستی ناوچەی کون کردنەکەش نەسووتابێ. چونکە دەبێتە هۆی هەوکردن.

٢- ئەو نخۆشانەی کە بەرگریی جەستەیان کەم بۆتەوەو بەرگریی ئەو تەکنیکە ناکەن.

## ڕێگاکانی کون کردنی بۆڕی هەناسە

Fig. 12-6. Cricothyroidotomy. A, Incision.

**أ- کون کردنی بۆڕی هەناسە لەناوچەی کرکراگەی دەرەقیەوە واتە «Cricothyroidotomy»:**

هەنگاوەکانی ئەم تەکنیکە ئەوانەن:
١- ئامادەکردنی پێستی ناوچەی مل و داپۆشتنی بەقوماشێکی بێ میکرۆب. ٢- بەدەستێک قورگی نەخۆشەکە بگرەو بەناو لەپی دەستەکەی دی یەکسەر لەژێرەوەی قورگ هەست بەکرکراگەی دەرەقیی دەکەیت. ٣- شەق کردنی پێستی ناوچەکە بەهۆی چەقۆیەکی ژمارە «١٥»ی بەدەسک، بەشێوەیەکی ئاسۆیی و بەرەو قورگ. پێویستە درێژایی شەق کردنەکە «٦» یان «٧» ملم بێت. ٤- مەقەستێکی نووک پەل ڕەوانی ناو برینەکە دەکرێ و لێوارەکانی بەشێوەیەکی ئاسۆیی لەیەکتر جیادەکرێتەوە. ٥- تیوبێکی «٨» ملم چەسپ بکە «کەچی لەمندالاَندا تیوبێکی بچوکتر بەکاردەهێنرێ». پزیشکێکی کارامە دەتوانێ ئەم تەکنیکە بەماوەی «٣٠» چرکە تەواو بکات. بەلاَم ئەم تەکنیکە پڕ لەمەترسیەو تەنها لەکاتێ فریاگەرێداو بۆماوەیەکی کورت ئەنجام دەدرێت. کەچی سادەترو ئاسانترەو بێ دوودلیی وشێوان ئەنجام دەدرێت و پێویست بەکەل و پەلێکی زۆر ناکات (وێنە 12-6).

**ب- کون کردنی بۆڕی هەناسە بەشێوەیەکی ستوونیی «Standard tracheostomy»:**

Fig. 12-6. cont.d. B, Spreading the opening. C, Placing the tube.

١- ناوچەکە وەکو تەکنیکی پێشوو ئامادە دەکرێت. ٢- پارچە قوماشێکی قەد کراو لەژێر شانی نەخۆشەکە دابنێ. ٣- برینێکی کورتی ستوونیی لەناوەڕاستداو ڕێک لەسەر خاڵی سەرەوەی کۆڵەی سنگ «Suprasternal notch» بکە. هەرچەندە برینداركردنێکی ئاسۆیی دوای چاک بوونەوە، شێوەی ناوچەکە ناشیرن ناکات وێنە (12-7).

٤- برینەکە بەرەو خوارەوە بەنێو شانەی ناوەڕاستی مل و بەنێوان ماسولکە پێکەوە لکاوەکاندا «Strap muscles» ئاراستە بکە. بێگومان بەر لەدروست کردنی برینەکە، پێویستە گیرەیەک بەکاربهێنرێ بۆ هەڵگرتنی شانەکان. ئنجا بەناو لەپی دەست هەست بە بۆری هەناسە دەکرێ و یەکەم ئەلقەی بۆری هەناسە دەدۆزرێتەوە. بۆئەوەی بۆریەکی هەوا «Tracheostoy tube» لە ئاستی دووەم و سێیەم ئەلقەی بۆری هەناسەدا چەسپ بکرێت. بەرزەخ «Isthmus» ببینەوە کە لەسەریانەوە ڕاکشاوە و بەهۆی هەردو نووکی گیرەیەکەوە بیکە بە دوویەش و بەداوی نەشتەرگەریەوە بیبەستەوە. یاخود بەرزەخ بەرەو سەرەوە لابدە ئنجا لەهێڵی ناوەڕاستدا دووهەم و سێیەم ئەلقە ببڕە. ئەم برینەش باڵۆنی تیوبی هەوا کون دەکات. ٥- بەهۆی گیرەکەوە برینەکەی بۆری هەناسە فراوان بکەو گەورەترین تیوب بخەرە ناو بۆری هەناسە کە ڕێک بەقەدەر فراوانیی برینەکە بێت. بۆ ئەوەی بەرگری هەوا لەو پەڕی کەمیدا بێ، هەڵمژینی شلە «Suction»ی کۆئەندامی هەناسەدان ئاسانتر بێت، باڵۆنەکە بەکەمتر هەواپڕ بکرێت. ٦- چەسپ کردنی تیوبی هەوا «Tracheostomy tube» بەدوو ڕێگا ئەنجام دەدرێت:

أ- باڵە پلاستیکیەکانی تیوبەکە لەهەردوو لای برینەکەوە بەپێستەوە بدوورەوە بەهۆی داوێکی «2-0» یاخود گەورەتر.

ب- ئەو دووپارچە پەتە یاخود سارغییە بیەستەوە بەدەوری مل کە بەتیوبەکە لکاون (وێنە 12-8). ئەمەش دوای ئەوەی کە قوماشە قەدکراوەکەی ژێر شان لادەبرێت. برینی دەورویەری تیوبی بۆری هەناسە بپێچەوە بۆ پاراستنی لەپیس بوون. نابێ برینەکە بدوورێتەوە «دوای دەرهێنانی تیوبەکە». بۆ منالی شیرخۆر «Infant» تیوبی سیلاستیکی بچوکی یەک لا «Unicuffed» بەکاردەهێنرێ (وێنە 12-9)، چونکە کاریگەریەکەی زۆر کەمترەو لەگەڵ جوولانەوەدا دەچەمێتەوە. دیوارەکەشی

Fig. 12-7. Tracheostomy.

Fig. 12-8. Securing the tracheostomy tube.

Fig. 12-9. Tracheostomy tube. A, Adult. B, Child.

لەجۆری پلاستیکیی گەورەترە. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە تەکنیکی کون کردنی کرکراگەی دەرەقـــــیــی «Cricothyroidotomy» لەکـاتی فـریاگـەریی و بۆمـاوەیەکی کـەم خـایەن بەکاردەهێنرێ. بەڵام تەکنیکی کون کردنی بۆڕی هەناسە «Tracheostomy» بۆ مـاوەیەکی بەردەوام لەبۆڕی هەناسەدا دەمێنێتەوە.

**سەرباره خراپەکانی کون کردنی بۆڕی هەناسە «Complications of tracheostomy»**

١- لەئەنجامی نەشتەرگەریەکەوە «Operative»:

أ- برینی خوێنبەری مل «Carotid artery» یاخود خوێنهێنەری مل «Jugular vein».

ب- برینی دەماری قوڕگ «Laryngeal nerve».

جـ- خوێن بەربوونی گلاندی دەرەقی «Thyroid bleeding».

د- کون بەدەرکردنی دیواری پشتەوەی بۆڕی هەناسە.

هـ- پەیدابوونی هەوا لەبۆشـایی سنگدا «Pneumothorax» لەئەنجـامی برینداربوونی پەردەی بۆشایی سنگ و هەڵمژینی هەوا بۆ ناو بۆشایی سنگ بەنێو برینی کراوەدا. یاخود داپچڕانی تەنکە پەردەی بۆشایی سنگ. بێگومان ئەو سەرباره خراپانەی لەسەرەوەدا باس کران دووچاری نەخۆش نابن ئەگەر هاتو تیـوبەکـە رێک لەشـوێنی خـۆیدا چەسپ بـکرێت و ڕووناکـیـەکی چاک دابین بکرێت، یاریدەدەری چاک هەبن، ئامـێری چاک بەکاربهـێنرێن، ناوچەکە سڕ بکرێت و ماوەیەکی باش هەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

٢- سەربارەکانی پاش نەشتەرگەریی «Indwelling complications»:

أ- سەری تیوبەکە دەبێتە هۆی برینداربوون.

ب- هەندێ جار تیوبەکە دەچێتە ناو بۆڕیچکەی هەناسەی لای ڕاست.

ج- داخرانی تیوبەکە بەهۆی شلەی کەناڵی هەناسەدانەوە، بەجۆرێک کە لەمنداڵی شیرخۆردا خراپترەو دەبێتە هۆی مردن بەتایبەتی لە منداڵی پێ نەگەیشتوو «Premature baby».
د- دەرچوونی تیوبەکە لەشوێن خۆیدا دەبێتە هۆی مەرگ.
هـ- هەڵزڕانی باڵۆنی بۆڕی هەناسە لەو نەخۆشانەی کە بەهەوا بەخشین چارەسەردەکرێن. ئەمەش قەیرانێکی گەورەیە.
و- دەبێتە هۆی هەوکردنی بۆشایی سنگ «Mediastinitis».

٣- درەنگە سەربارەکان «Late complications»:
أ- تەسک بوونەوەی بۆڕی هەناسە «Tracheostenosis».
ب- شەلەلی بۆڕی هەناسە «Tracheomalacia».
ئەم دوو حاڵەتەی سەرەوە لەئەنجامی چەسپ کردنی تیوبی یاخود کون کردنی بۆڕی هەناسەوە ڕوودەدەن.
ج- مردنی خانەکان «Necrosis» بەهۆی پاڵەپەستۆ و تێک شکاندنی کرکراگەکان لەئەنجامی ئازارگەیاندنی باڵۆنەکە بەبۆڕی هەناسە کە لەسەرەتادا بەداڕووشان و مردنی خانەکانی ناوپۆشی بۆڕی هەناسەوە دەست پێ دەکات ئنجا پەرە دەسێنێ، بەجۆرێک نەمانی کرکراگە لەبۆڕی هەناسەدا دەبێتە هۆی بێ هێزبوونی بۆڕی هەناسە کە تەنها لەکاتی هەناسە وەرگرتندا ڕێڕەوی هەناسە دادەخرێ. هەروەها نەمانی کرکراگە دەبێتە هۆی تەسک بوونەوەی بۆڕی هەناسە کە لە ئەنجامدا لەهەردوو باری هەناسە وەرگرتن و دانەوەدا، ڕێڕەوی هەناسە دەگیرێت.
د- ڕێژەیەکی بەرز لە نەخۆشەکان تووشی تەسک بوونەوەی بۆڕی هەناسە دەبن، بێ ئەوەی نیشانەکانیان لێ بەدیار بکەوێ. شێدار کردنەوەی هەواو بەخشینی هەوا بە نەخۆشەکە. دووکاری بنەڕەتن. هەروەها نیوەی نەخۆشەکان پێویستیان بە پاڵپشت کردنی هەناسەدان دەبێت «Respiratory support» ئەوانی دی پێویستیان بەوە دەبێت ناو ناوە بەڕێگای لووتەوە هەڵمژینی بۆڕی هەناسەیان بۆ دابین بکرێت. چونکە ئەگەر هاتو بەشێوەیەکی چاک گرنگیی بەڕێڕەوی هەناسەو هەناسەدانی نەخۆشەکە نەدرێت، لەئەنجامدا مەرگی نەخۆشەکە دێتە پێشەوە.

## بووژاندنەوەی دڵ و سییەکان

### «Cardiopulmonary resuscitation»

بێگومان ئەم کارە پێویستی بە خێرایی و توانایەکی چاک هەیە. دواکەوتن مەرگی بەدوادا دێت. دەبێ بەخێرایی هێندی پێویست لە ئۆکسجین بۆ شانەکانی لەش دابین بکرێت. نەگەیشتنی ئۆکسجین بە شانەی دەماغ دوای «٤» دەقیقە دەبێتە هۆی دوو

مەترسیی گەورە کە چاک بوونەوەیان بۆ نیە، ئەوانیش بریتین لە ئازار گەیاندن بە مێشک و مردن.

**نیشانەکانی وەستانی دڵ «Cardiac arrest»**

١- نەمانی هەناسەدان.
٢- نەمانی لێدانی دڵ لەناوچەی ڕان و ملدا.
٣- فراوان بوونەوەی بیلبیلەی چاو.

جا لەکاتی وەستانی دڵدا ئەگەری دووشت دەکرێت:

یەکەم: نەخۆشەکە برێکی تەواو لە ئۆکسجینی هەبێت بۆ بەردەوام بوونی ئەرکی مێشک بۆ ماوەی «٤» دەقیقە ئەمەش بەدابین کردنی سووڕی خوێن دەکرێت.

دووەم: دڵ لەیەکێک لەم ئاواز «Rhythm» انەی خوارەوە دا خۆی دەنوێنێ:

١- وەستانی تەواوی دڵ «Cardiac standstill».
٢- لەرزینی سکۆڵەیی «Ventricular fibrillation».
٣- خێرابوونی لێدانی سکۆڵەیی «Ventricular tachycardia».

بۆ چارەسەرکردنی دووەم ئەگەر، چەند شێلانێکی بەهێز ئاراستەی نیوەی کۆتایی خوارەوەی ئێسکی کوڵەی سنگ «Sternum» دەکرێت بەهۆی قوچاندنەوەی لەپی دەستێک و پاڵدانی بەدەستەکەی دی، دوای بەرزکردنەوەی هەردوو دەستەکان لەماوەی نێوان شێلانەکاندا بەدووریی «١٢-١٨» ئینج لەسەرەوەی سنگ. ئەمەش پێی دەووترێ شێلانی دڵ «Cardiac massage» کە لەوانەیە خێرابوونی لێدانی سکۆڵەیی یاخود وەستانی دڵ بگۆڕێ بۆ ئاوازێکی سروشتیی «Normal rhythm».

## هەنگاوەکانی رزگارکردنی ژیان بەهۆی دڵ شێلانەوە

**«Advanced cardiac life support= ACLS»**

**«Basic cardiac life support=BCLS»**

١- کردنەوەی ڕێڕەوی هەناسە «Airway control»: لەسەرەتادا دەرەنجامەکانی ڕشانەوە لەناوچەی گەروی نەخۆشەکە بسڕەوە، چەناگەی بەرز بکەوەو چەناگەی بەرەوپێشەوە بێت «شەویلاگی خوارەوەی بەرەو پێشەوە بێت»، ئنجا تیوبی گەروی بۆ چەسپ بکە (وێنە1-13).
زۆرجار وەستانی دڵ لەچێشتخانەکاندا بەهۆی پارچە گۆشتێکەوە ڕوودەدات کە لە قوڕگی نەخۆشەکە گیر دەبێت. بۆ چارەسەرکردنی ئەم حالەتە، لەچەشنی ئامێزگرتنی دووڕچ هەردوو دەستەکانت لە دەوری بەشی خوارەوەی سنگی نەخۆشەکە بئاڵێنەو لەباوەشی خۆتی بگرە ئنجا بەخێرایی و بەهێزەوە نەخۆشەکە لەئامێزت ڕابگوشە. ئەم گوشینە ناکاو بەهێزە نزیکەی «٢٠٠-٤٠٠» مل هەوای سینگ پاڵ دەداتە دەرەوەو ڕێڕەوی قوڕگ دەکاتەوە.

**Fig. 13-1.** Jaw thrust. push the angle of the mandible forward with the fingers to clear the airway. a pharyngeal airway is helpful. Use a breathing mask, as shown, if available, or use mouth-to-mouth ventilation.

٢- هەوا بەخشین «**Ventilation**»: ئەمەش بەهۆی هەناسەدانی دەم بۆ دەم یاخود بەرێگای میکانیکی‌یەوە ئەنجام دەدرێت (وێنە 13-2).

٣- شێلانی دڵ لەدەرەوەی جەستەدا «**External cardiac massage**»: (وێنە 13-3) ناو لەپت بخەرە سەر سێ‌یەکی خوارەوەی کۆڵەی سنگ ئنجا بەتیژیەوەو بە قوڵایی «٣-٥»سم ناوچەکە پاڵدەخەوارەوە، بۆ ئەوەی هەردوو سکۆڵەی دڵ بکەونە نێوان کۆڵەی سنگ و بڕبڕەی پشتەوە. بەم جۆرە خوێن لەدڵەوە دەردەچێت بەرەو خوێنبەری سی‌یەکانەوە (وێنە 13-4). بەمەرجێک پێویستە لە گەورەاندا «٦٠» پاڵدان لەدەقیقەیەکدا ئەنجام بدرێت. بەڵام لەمنداڵی شیرخۆردا دەستێکت بخەرە پشتی و دووپەنجەت بۆ پاڵدانی ناوچەکە بەکاربهێنەو «١٠٠» پاڵدان لەدەقیقەیەکدا ئەنجام بدە (وێنە 13-5). بەڵام لەمنداڵاندا نابێ زۆر بە توندیی بێت چونکە دەبێتە هۆی هەڵزڕانی جگەر. لەئەنجامی شێلانی

**Fig. 13-2.** Mouth-to-mouth ventilation.

دڵەوە، ئەو هێندی خوێنەی کە لەدڵەوە دەردەچێت لەنیوەی تێکڕای سروشتیی زیاتر نابێت. پاڵەپەستۆی خوێن ١٠٠/سفر دەبێت و تێکڕایەکەی «٤٠-٥٠» ملم جیوەیە. هەروەها لەئەنجامی شێلانی دڵەوە خوێنی مێشک دەگاتە ٣٠-٤٠٪ی هێندی سروشتیی. لەتوانادا هەیە شێلانی دڵ لەدەرەوەی جەستەدا بەهەست پێکردنی لێدانی دڵ لەبنکەی ڕانی نەخۆشەکەوە «**Femoral artery**» پێوانە بکرێت. چونکە لێدانی دڵ لەبنکەی ڕانەوە بەڕادەیەکی وا هەستی پێ دەکرێت کە تەنانەت ئەگەر هاتو هێندی دەرچووی خوێن لەشاخوێنبەرەوە «**Aorta**» کەمیش بێت.

**Fig. 13-3.** Placement of hands for external cardiac massage.

**Fig. 13-4.** Mechanics of external cardiac massage.

**Fig. 13-5.** External cardiac massage in infants.

## شێلانی دڵ لەناوەوەی جەستەدا

**«Internal cardiac massage»**

ئەم تەکنیکە لەم حالەتانەی خوارەوەدا ئەنجام دەدرێت:

١- ووردو خاش بوونێکی بەتین لەسنگدا «Severe crushed chest» .

٢- کۆبوونەوەی خوێن لەدەوروبەری دڵ «Cardiac tamponade» .

٣- برینەکانی دڵ «Cardiac wounds» .

٤- چاڵ بونی بەشی خوارەوەی کۆڵەی سنگ لەگەڵ دەرچونی بەشی سەرەوە بۆ دەرەوە «Pectus carinatum» .

٥- پەنگ دانەوەیەکی بەتینی هەوا لەبۆشایی سنگدا «Severe emphysemia» .

٦- ئەگەر هاتو شێلانی دڵ لەدەرەوەی جەستەدا کاریگەر نەبێت.

**هەنگاوەکانی شێلانی دڵ لەناوەوەی جەستەدا:**

بێگومان ئەم کارە لەلایەن نەشتەرگەرێکی کارامەوە ئەنجام دەدرێت.

١- ناوچەی ژێرەوەی مەمکی چەپە هەڵدەزرێنێ، هەر لە کۆڵەی سنگەوە «Sternum» تاوەکو هێڵی خەیالیی پێشەوەی ژێر باڵ «Anterior axillary line» .

٢- برینەکە بەنێو نێوانە پەراسووەکانەوە دادەبرێتە ناو سنگ.

٣- بەشی سەرەوەی کرکراگەی پەراسو «Upper costal cartilage» دەبڕێ واتە ئەو بەشەی کە بە کۆڵەی سنگەوەیە.

٤- دوور لە دەماری ناوپەنچک «Phrenic nerve» ، پەردەی دڵ «Pericardium» هەڵدەزرێنێ بەهۆی مەقەستێکەوە.

٥- دەستێکی دەخاتە ژێر دڵەوەو دژ بە کۆڵەی سنگ دەیگوشێ. یاخود دەستەکەی دی دەخاتە دیوی پێشەوەی دڵ ئنجا بەهۆی هەردوو دەستەوە دڵ رادەگوشێ.

پێویستە نەشتەرگەریی کردنەوەی سنگ «Thoracotomy» لەماوەی «١-٢» دەقیقەدا بکرێ و لەهۆڵی نەشتەرگەرییدا سنگی نەخۆشەکە دابخرێتەوە. بەڵام پێویست بەرێک خستنی نێوان هەوا بەخشین و شێلانی دڵ ناکات.

## رزگارکردنی ژیان بەشێوەیەکی پێشکەوتوانە

**«Advanced Life Support =AlS»**

ئەم تەکنیکە پێویست بەتیپێک دەکات کە ژمارەیان «٤-٦» کەس بێت لەگەڵ دووکەس بۆ هەوا بەخشین و شێلانی دڵ لەدەرەوەی جەستەدا. یەکێک بۆ ئامێری لەرزێنەرو نەخشەی کارەبایی دڵ «ECG defibrillator» و یەکێک بۆ بەخشینی شلە لە رێگای خوێنهێنەرەوە. یەکێک بۆ سەرپەرشتی کردنی دەرمانەکان. ئەو حالەتانەی کە پێویست بە ئەنجامدانی ئەو

تەکنیکە دەکات بریتین لە:

١- لەرزینی سکۆڵەی دڵ «Ventricular fibrillation».

٢- خێرابوونی لێدانی سکۆڵەی دڵ «Ventricular tachycardia».

## هەنگاوەکانی ALS:

پێش هەموو شتێک دەبێ نەخشەی کارەبایی دڵ «ECG» بۆ نەخۆشەکە بکرێ. ئنجا ڕۆن «Cream»ێکی گەیەنەر بەسەر شوێنی هەردو سەری ئامێری لەرزێنەرەکەوە پەرش دەکرێتەوە. بەجۆرێک کە دەبێ دوو سەری ئامێرەکە بخرێتە سەر ناوچەی بنکەو لووتکەی دڵ. ئەنجا بەهۆی ئامێرەکەوە هێزێکی کارەبایی «٢٠٠-٣٠٠» جوول ئاراستەی دڵی نەخۆشەکە دەکرێت (وێنە 13-6). ئەگەر هاتو بەمەبەستی بە ئیش کردنەوەی دڵ، دوو لێدانی کارەبایی لەدوای یەک و خێرا، سەرنەکەوێ، دیارە هێندی ئۆکسجینی دڵ کەمەو پێویستە تەکنیکی شێلانی دڵ و هەوا بەخشین بۆ ماوەی «٢-٣» دەقیقە دووبارە بکرێتەوە. دیسان هەوڵ بدەوە. هەروەها پێویستە «I.V» بۆ نەخۆشەکە دابین بکرێ. برینی خوێنهێنەری گوزنگ «Saphenous cutdown» زۆر بەسوودە بۆ ئەو مەبەستە. چونکە قەستەرەی خوێنهێنەر یەکسەر بۆ دڵی نەخۆشەکە ڕێگای ئەوەمان دەدات کە بەخێرایی دەرمان بچێتە دڵەوە. بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی شێلانی دڵ لەدەرەوەی جەستەدا تەکنیکی قەستەرە خستنە دڵەوە، زەحمەت دەبێت.

Fig. 13 -6. Placement of external defibrillator paddles.

بۆیە دەست بەجێ دوای وەستاندنی تەکنیکی شێلانی دڵ ئنجا قەستەرەی دڵ ئەنجام دەدرێت. بەخشینی دەرمانەکانیش بەم چەشنەی خوارەوەیە:

یەکەم جار: ئەمپولێک واتە «٥٠»یەکەی پێوانەیی «MEq» لە سۆدیۆم کاربۆنەیت بەڕێگای خوێنهێنەرەوە دەدرێتە نەخۆشەکە، بەمەرجێک گازی خوێن دابین بووبێت.

دووەم: ئەگەر نا «٢٥»یەکەی پێوانەیی هەر «١٠-١٥» دەقیقە جارێک. چونکە گشت نەخۆشەکانی ئەم حاڵەتە خوێنیان ترشاوی «Acidosis» بوە.

سێیەم: بۆ لەرزینی سکۆڵەو خێرابوونی لێدانی دڵ «١» ملگم/کلگم لە لیدۆکاین دەدرێتە نەخۆشەکە.

چوارەم: «٢-٤» ملگم/دەقیقە لەماددەی لیدۆکاین. چەند دەرمانێکی دیش هەن کە دژ بەتێکچوونی ئاوازی سکۆڵەن: پرۆکاینەماید، بریتایلیەم، توسایلەیت،

هەروەها ڤیراپامیل بۆ تێکچوونی ئاوازی دڵ لەسەرەوەی سکۆڵەوە «Supraventricular arrhythmias».

ئێپینێفرین بەهێندێکی زۆر واتە «٠,٥» ملگم یاخود «٥» مل بەشێوەیەکی ڕوون کراوە بەڕێژەی «١ / ١٠٠٠٠» لەکاتی وەستانی بەتەواوی دڵ «Cardiac standstill» بەکاردەهێنرێ هەروەها بۆ کاتی لەرزینی دڵ بەلام ئاوازێکی سروشتیی هەبێت «Normal sinus rhythm» هاوکاتیش بێ لەگەڵ کەم بوونەوەی هێندی ئەو خوێنەی کە لەدڵەوە دەردەچێت.

کالسیوم کلوراید «Cacl 2» بەهێندی «١» گم یاخود بەشێوەی «١٠» مل لەگیراوەی ١ / ١٠، کورژبوونەوەی ماسولکەی دڵ «Myocardial contractility» چاک دەکاتەوە.

## بەکارهێنانی ئێپینێفرین یەکسەر بۆ دڵ
## «Epinephrine directly to the heart»
## «Pericardiocentesis»

**چەند ڕێگایەک هەن بۆ ئەو تەکنیکە:**

١- ژێرەوەی زیادە ئێسکی کوڵەی سنگ «Subxyphoid»: بۆ ئەو مەبەستە نیدلێکی دەرکەوانە «Gauge» «٢٠» و درێژی «٣» ئینج بەکاردەهێنرێ. بەخستنە ژوورەوەی نیدلەکە لەلای چەپی ئێسکی خوارەوەی کوڵەی سنگ و ئاراستەکردنی بەرەوشانی چەپی نەخۆشەکە.

٢- لووتکەی دڵ «Apix»: نیدلەکە دەخرێتە ژێرەوەی مەمکی چەپ و لەسەر هێڵی خەیالیی ناوەڕاستی چەڵەمە «تەرقوە» بەسەرەوەی پەراسوودا بەرەو شانی ڕاست تێپەڕدەکرێت. ئەم تەکنیکە لە خوێنبەری تاجیی «Coronary artery» دوورە بەلام مەترسی کون کردنی سی «Lung» لێدەکرێ.

٣- ڕێگای پێشەوە: «Anterior»: ئەم ڕێگایە بریتیە لەخستنە ژوورەوەی نیدلەکە لەسەرەوەی پەراسووی پێنجەم و بەرەوپێشەوە بۆلای چەپی کوڵەی سنگ. ئنجا پاڵدانی نیدلەکە ڕێک بۆ دواوە (وێنە 13-7). ئەمەش مەترسی لێدانی مەمکە خوێنبەری ژوورەوەی لێ دەکرێت. هەروەها لێدانی سی و لێدانی بەشی دابەزیوی پێشەوە لە خوێنبەری تاجیی.

یەکەم ڕێگا لەهەمویان چاکترە بەلام سێیەم ڕێگا پڕ لە مەترسی‌یە چونکە دەبێتە هۆی برینداربوونی دڵ و خوێن بەربوون و کۆبوونەوەی خوێن لە دەوروبەری دڵ «Cardiac tamponade». ئەو تەکنیکانە تەنها لەوکاتەدا ئەنجام دەدرێن کە دڵ وەستابێ و ڕێگای خوێنهێنەر لەتوانادا نەبێت «تەنها یەک جار ئەنجام دەدرێت و دووبارە ناکرێتەوە».

Fig. 13-7. Technique of cardiac puncture for intracardiac injection.

## بەرزکەرەوەکانی پاڵەپەستۆی خوێن

«Systemic pressor agents»

بریتین لەو ماددانەی کە بەشێوەیەکی تیۆریی لوولە خوێنەکانی مێشک و دڵ هەڵدەبژێرن و کارێکی زیاتریان لەسەر دەکەن یاخود ئەو ماددانەی کە قەبارەی خوێن زیاتر دەکەن و هێندی ئەو خوێنە زیاتر دەکەن کە لەدڵەوە دەردەچێت. بێگومان پاڵەبەستۆی خوێنبەر گەورەترین هۆکارە بۆسەر جوولەی خوێن و کەم بوونەوەی هێندی ئەو خوێنەی کە لەبەشەکانی لەشدا گوزەر دەکات، دەبێتە هۆی پەیدابوونی چەند حالەتێکی نەخۆشیی هەروەک تێک چوونی کاری ئەندامەکان، هەست کردنێکی ناسروشتیی، کارنەکردنی ماسولکەی دڵ بەشێوەیەکی چاک، کەم بوونەوەی میز «Oliguria» چەند گۆڕانکاریەک لە لوولە خوێنەکانی چیوەی لەش «Peripheral vesseles». بۆیە پاڵەپەستۆی خوێن بەهۆی «هێندی ئەو خوێنەی کە لە دڵەوە دەردەچێت لەگەڵ بەرگریی لوولە خوێنەکانی چیوەی لەش» ژمێرە دەکرێت. واتە:

پاڵەبەستۆی خوێن = هێندی خوێنی دەرچوو لە دڵەوە × بەرگریی لوولەیی چیوەی لەش.

**PVR "Peripheral vascular resistance"X CO "Cardiac output" = BP**

هێندی خوێنی دەرچوو لەدڵەوە بریتیە لە بەرهەمی تێکڕای لێدانی دڵ لەگەڵ قەبارەی چەمکی لێدانی دڵ. دیسانەوە چەمکی لێدانی دڵ چەند هۆکارێکی هەیە. بۆیە لەتوانادا هەیە کە دابەزینی پاڵەبەستۆی خوێن بەچەند ڕێگایەکی جیاجیا چارەسەر بکرێت هەروەک لەسەرەوە باسمان کرد بەهۆی کورژکەرەوەی لوولەخوێنەکان «خوێنبەر یاخود خوێنهێنەرەکان»، زیادکەرەوەی قەبارەی خوێن، هەروەها ئەو ماددانەی کە لەکاتی بوورانەوەدا لەگەڵ ئەوانەی سەرەوە بەکار دەهێنرێن و کاردەکەنە سەر دڵی مرۆڤ.

**چەند نموونەیەک بۆ بەرزکەرەوەکانی پاڵەپەستۆی خوێن:**

١- نۆرئێپینێفرین.

٢- ئێپینیفرین.

٣-دۆپامین.

بەلام مادده کورژکەرەوەکانی چیوەی لەش ترسناکن، چونکە خێرایی گوزەری خوێن کەم دەکەنەوە.

٤- «٥٠٠-١٠٠٠» مل لەگیراوەی خوێی سروشتیی N.S یاخود ڕینگەر لاکتەیت، قەبارەی سووڕی خوێن زیاتر دەکەن وهێندی خوێنی دەرچوو لە دڵەوە زیاتر دەکەن.

هەروەها گەلێ دەرمانی تر هەن بۆ بەرزکردنەوەی پاڵەپەستۆی خوێن لەکاتێکدا کە پێویستە گشت ئەو جۆرە دەرمانانە بەزانایی و بەئاگاداریەوە بەکاربهێنرێن چونکە لایەنی چاک و لایەنی خراپیشیان هەیە هەروەک: ئەدرینالین، ئیتیلیفرین هایدرۆکلۆراید، ئایزۆپرینالین هایدرۆکلۆراید، میتارامینۆل تارترەیت، میثۆکزامین هایدرۆکلۆراید،

نۆر ئەدرینالین ئەسید تارترەیت، ئۆکسیدرین تارترەیت. هەروەها گرووپی کۆرتیکۆستیرۆیدەکان وەکو دیئۆکسی کۆرتۆن ئەسیتەیت، فلودرۆکۆرتیزۆن، مەثیل پریدنیزۆلۆن سۆدیۆم سەکسینەیت.

هەندێ لەو ماددانەی سەرەوە بۆ چارەسەرکردنی بوورانەوە بەکاردەهێنرێن و هەندێکیشیان لەباری ئاسایی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن بەکاردەهێنرێن. بەڵام پێویستە زۆر بەزانایی و ئاگاداریەوە بەکاربهێنرێن و دەبێ لەلایەن پزیشکی لێهاتووەوە ئاماژەیان بۆ بکرێت. چونکە لایەنی چاک ولایەنی خراپیشیان هەیە.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بزانین کە هەموو بوورانەوەیەک «Shock» مەرج نیە هۆیە سەرەکیەکەی شێوانی باری دڵ بێت بەڵکو بوورانەوە سێ جۆری سەرەکیی هەیە کە بریتین لەمانە: ١- بوورانەوە لەئەنجامی کەم بوونەوەی قەبارەی خوێن«Hypovolaemic Shock». ٢- لەئەنجامی بەژەهراوی بوونەوە «Endotoxic Shock». ٣- بوورانەوە بەهۆی دڵەوە «Cardiogenic Shock».

## بنەماکانی گرنگی دان بەکوترانی جەستە

### «Principles of trauma care»

مەبەستمان لە کوتران «Trauma» لێدانی جەستەی مرۆڤە لەئەنجامی هەر کارەساتێکەوەبێت. لەکاتی فریاکەوتنی کوترانی جەستەدا کاتێک هەیە کەپێی دەووترێ کاتژمێری زێرین «Golden hour». ئەمەش گرنگیەکەی لەوەدایە کە ماوەیەکی زێرینە بۆ ناسینەوەو دەست نیشان کردنێکی چاپووکانەی بارە نائاساییەکانی جەستەو بریتیە لە یەکەم هەنگاوی چارەسەرکردن کە پارێزگاریی ژیانی زۆربەی قوربانیەکان دەکات.

بایەخدان یاخود چارەسەرکردنی کوترانێکی توند «Acute trauma» بەم هەنگاوانەی خوارەوەدا تێدەپەرێ:

١- پشکنینی سەرەتایی «Primary survey»: بۆ دیاری کردنی ئەو حالەتانەی کە ژیانی نەخۆشەکە دەخەنە مەترسیەوە. هەروەک گیرانی هەناسە «Airway obstruction» و بوورانەوە «Shock».

٢- بووژاندنەوە «Resuscitation».

٣- دووەمین پشکنین واتە «Secondary Survey»: کە بریتیە لە پشکنینێکی تێکڕایی و بەدرێژیی.

٤- پشکنین وبایەخدانی کۆتایی «Definitive survey» بەگشت برینەکانی نەخۆشەکە.

### ١- پشکنینی سەرەتایی

یاخود پێی دەووترێ «هەڵسەنگاندنی سەرەتایی» ئەویش بریتیە لەچارسەرکردنی نەخۆشەکە بە پەیرەوی کردنی پرۆتۆکۆلێک بۆ ئەنجامدانی ئیشی گرنگتر بەر لە گرنگ.

«A» واتە «Airway» بریتیە لەپاریزگاری کردنی ڕێڕەوی هەناسەو پاراستنی مۆخی ملی نەخۆشەکە.

گیرانی هەناسە بەوە دەناسرێتەوە کە گۆڕانی جیاجیا لەئاستی هۆشی نەخۆشەکەدا ڕوودەدات:

أ- وورووژان «Agitation» کە لەئەنجامی کەم بوونەوەی ڕێژەی ئۆکسجین «Hypoxia» ڕوودەدات.

ب- خەوالوبون «Obtundation» کە لەئەنجامی زیادبوونی ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن «Hypercarbia» ڕوودەدات. هەروەها بێجگە لە «أ» و «ب» گیرانی هەناسە بەهۆی کوتران و ئازار گەیشتن بەمل و ڕووی نەخۆشەکە دەناسرێتەوە «Diagnosed».

پێویستە وێنەی تیشکی ئێکس بۆ حەوت بڕبڕەکانی ملی نەخۆشەکە بگیرێت چونکە لەئەنجامی کارەساتەوە گومان لەشکانی بڕبڕەی مل «Cirvical fracture» دەکرێت. هێمای شکان لەڕاپۆرتی پزیشکییدا بریتیە لە «#» بۆیە ئەگەر هاتو سەرەوەی ئێسکی چەلەمە «تەرقوە» بریندار بوبو بەتایبەتی برینی گەورە لەسەردا، پێویستە وێنەی تیشکی ئێکس بۆ بڕبڕەکانی مل بگیرێت. کاتێ کە بڕبڕەی مل شکابێ، نابێ جوولە بەسەری نەخۆشەکە بکرێت. هەروەها پێویستە بڕبڕەکانی مل لەسەریەک هێلدا بن و نابێ ملی نەخۆشەکە بقوچێتەوە.

• بەمەبەستی قەدەغەکردنی گیرانی هەناسە، ڕێڕەوی هەناسەی نەخۆشەکە بە جۆرێک بکەوە شەویلاگ پاڵ بدەو چەناگەی بەرزبکەوە. هەروەها تیوبی لووت بۆ گەرو ڕێگایەکی چاکترە بۆ هەناسەدانی ئەو نەخۆشەی کە هۆشی لەخۆی بێت و خۆی لێی بێزار نەبێت. بەڵام ئەگەر هاتو لەتوانادا نەبێت تیوبی هەناسەدان بخرێتە بۆڕی هەناسەوە، پێویست بە تەکنیکی کون کردنی بۆڕی هەناسە دەکات لەڕێگای کڕکڕاگەی ملەوە «Cricothyroidotomy». یاخود ئەگەر هاتو ئازارێکی بەتین دووچاری شەویلاگی سەرەوەو ڕووی نەخۆشەکە هاتبێ، یان گومان لەبریندار بوونی مۆخی مل «Cirvical spine» بکرێت، ئەم دوو هۆیە ڕێگا لەچەسپ کردنی تیوبی هەناسەدان دەگرن.

«B» مەبەست «Breathing» واتە هەناسەدان: ئەم هەنگاوە بریتیە لە ئاگاداربوون لەمیکانیزمی هەناسەدان. شکانی پەراسووەکان زوو بەزوو مەرگی نەخۆشەکەی بەدوادادێت. چونکە کاردەکاتە سەر کارئەندامی دڵ و هەناسەدان، بۆیە پێویست بە تەکنیکی نەشتەرگەریی سادە دەکات «Simple surgical technique». دەربارەی هەناسەدانەوە پێویستە زانیاریەکی چاکت هەبێت دەربارەی نیشانەکای ئەم بارە نائاساییانەی خوارەوە:

١- پەنگدانەوەی هەوا لەبۆشایی قەفەزەی سنگدا «Tension pneumothorax»: ئەویش بریتیە لە پەیدابوونی دەرچەیەکی یەک زمانەی یەک لایەن لەنێوان سی «Lung»

نەخۆشەکە یاخود دەرەوەی لەش لەگەڵ بۆشایی سنگدا. بەجۆرێک کەلەکاتی هەناسە وەرگرتندا هەوا دەچێتە ناو بۆشایی سنگ بەڵام لەکاتی هەناسەدانەوەدا دەرناچێت. هەواش لەژێر پاڵەپەستۆدا بۆشایی سنگ پردەکات و دەبێتە هۆی:

أ- بەناویەکدا شێلانی سییەکان «Lung collapse».

ب- قەدەغەکردنی رۆیشتنی خوێن بەرەو دڵ.

پەنگدانەوەی هەوا لەبۆشایی قەفەزەی سنگدا بەم خاڵانەی خوارەوە دەناسرێتەوە:

١- نەخۆشەکە تووشی هەناسە تەنگی «Respiratory distress» دەبێت.

٢- لادانی بۆری هەناسە لەشوێنی خۆی «Tracheal deviation».

٣- دەنگی هەناسە لەلایەکی سنگ نامینێ و دەنگی سنگ بەهۆی پەنجەکانەوە زیاتر دەبێت «Hyper resonance».

٤- نزم بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن «Hypotension» و فراوان بوونەوەی خوێنهێنەرەکانی مل.

**چارەسەرکردنی پەنگدانەوەی هەوا لەقەفەزەی سنگدا:**

بریتیە لەوەی کە دەست بەجێ و بەخێرایی نیدلێکی گەورە دەخرێتە ناو بۆشایی سنگ «Pleural space» بەناو نێوانە پەراسووی دووهەمەوە لەسەر هێڵی ناوەڕاستی ئێسکی چەڵەمە «تەرقوە» «Midclavicular line». دوا هەنگاوی چارەسەرکردنی بریتیە لە خستنە ژوورەوەی تیوبی سنگ «Chest tube».

٢- پەنگە هەوای سنگ لەجۆری کراوە «Open pneumothorax»:

یاخود پێی دەوترێ برینی هەڵمژین لەسنگدا «Sucking chest wound» کە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی «کز بوونەوەی» هەناسەو کەم بوونەوەی ئۆکسجین «Hypoxia». چونکە لەکاتی هەناسەوەرگرتندا هەوای دەرەوە دەورووژێتە ناو بۆشایی سنگ و سییەکەش ناتوانێ فراوان بێتەوە. چارەسەرکردنی ئەم جۆرە کراوەیە لەپەنگە هەوای سنگ بەجێ بەجێ کردنی ئەم خاڵانە دەکرێت:

١- پێچانەوەی برینەکە زۆر بەرێک و پێکیی بەهۆی سارغییەوەو لەسێلایەنەوە بەجۆرێک تەنها رێگای دەرچوونی هەوا بدرێ لەکاتی هەناسە وەرگرتندا.

٢- هەرچەند لەتوانادابێ زوو بەزوو تیوبی سنگ بۆ نەخۆشەکە چەسپ بکرێت.

٣- پەیدابوونی تۆپەڵی خوێن لەسنگ دا «Massive Haemothorax» دەبێتە هۆی شێوانی باری دڵ و هەناسەدان. ئەمەش لەئەنجامی بەناویەکدا شێلانی سییەکە «Lung collapse» و خوێن بەربوونەوە. تۆپەڵی خوێن لەسنگدا بەتیوبی سنگ «Chest tube» چارەسەر دەکرێت.

٤- داسووکی سنگ «Flail chest»: بریتیە لە جۆرە شکانێکی پەراسوەکان کە هەردو سەری پەراسو دەپچڕێت. ئەمەش بەدوورێگا دەبێتە هۆی شێوانی باری هەناسەدانی

نەخۆشەکە:

أ- وون کردنی پێکهاتوە ئێسقانەکانی برگەی دیواری سنگ کە لەئەنجامدا لەکاتی هەناسە وەرگرتن و هەناسەدانەوەدا دیواری سنگ شێوەیەکی پێچەوانەیی وەردەگرێت. ب- هەڵزڕانی سی‌یەکان لەژێرەوەی ناوچەی برینی سنگدا.

## چارەسەرکردنی داسووکی سنگ

١- دابین کردنی ڕێڕەوی هەناسە. ٢- بەخشینی ئۆکسجین. ٣- قەرەبۆکردنەوەی قەبارەی خوێن. ٤- ئەگەر هاتو چەند برگەیەکی زۆر لە دیواری سنگ کون بوو بو، نەخۆشەکە پێویستی بە چەسپ کردنی تیوبی بۆری هەناسە «Endotracheal intubation» دەبێت لەگەڵ هەوا بەخشینی یاریدەدراو بەمەرجێک قەبارەی هەوا دیاری بکرێت. ٥-کۆبوونەوەی خوێن لە دەوروبەری دڵ «Cardiac tamponade» ئەمەش زوو دەبێتە هۆی مردن چونکە هێندێکی باش لە خوێن بۆ توورەگەی پەردەی دڵ «Pericardial sac» دابین نابێت بۆڕێگاگرتن لە پڕبوونی سکۆڵەی دڵ بەم جۆرەش بۆڕێگا گرتن لەهێندی ئەو خوێنەی کە لەدڵەوە دەردەچێت.

## نیشانەکانی کۆبوونەوەی خوێن لەدەوروبەری دڵدا بریتین لە:

١- دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن لەچەشنی بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێنهێنەر. ٢-نزم بوونەوەی دەنگی ئاوازی دڵ. ٣- لێدانی دڵ بەشێوەیەکی پێچەوانە «Pulsus paradoxus».

چارەسەرکردنی ئەم نیشانانەی سەرەوە بریتیە لە دەرکێشانی شلەی پەردەی دڵ «Pericardiocentesis» بەڵام ئەم چارەیەش تەکنیکێکی کاتیی و یەکجارەکیی نیەو لەدواجاردا نەخۆشەکە بە زووترین کات پێویستی بەنەشتەرگەریی کردنەوە واتا واڵاکردنی سنگ دەبێت «Open thoracotomy».

«C» مەبەست «Circulation» واتە سووڕی خوێن یاخود بوورانەوەو خوێنبەربوون: بریتیە لە قەرەبۆکردنەوەو پارێزگاری کردنی قەبارەیەکی پێویست لەخوێن و زانینی چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی باری کارئەندامەکانی نەخۆشەکە. هەروەها دیارکردنی هێندی خوێنی وون بو.

## پۆلەکانی خوێنبەربوون «Classes of haemorrhage»

**پۆلی ژمارە یەک«Class I»**: بریتیە لە وون کردنی «١٥٪»ی قەبارەی خوێن یاخود «٧٥٠» مل لەکەسێکی پێگەیشتو «Adult» کە تەمەنی مام ناوەندیی بێت، ئەم جۆرە

خوێنبەربوونە کەمترین نیشانەی لێ بەدیار دەکەوێت. لەتوانادا هەیە کە بەهۆی بەخشینی شلەی کریستالی‌یەوە چارسەربکرێت.

**پۆلی ژمـــــارە دوو «Class II»:** «١٥٪» - «٣٠٪» خـــوێن وون دەبێت یاخـــود «٧٥٠-١٥٠٠» مل تەنانەت وون بوونی یەک لیـتـریش لەخوێن نیـشـانەکـانی کـەمن. بەجۆرێک کە پاڵەپەستۆی خوێن پارێزراو دەبێت بەڵام:

١- کەم بوونەوەی پاڵەپەستۆی لێدانی دڵ «Decreased pulse pressure» روودەدات کە بریتیە لە جیاوازی نێوان ژمارەی گەورەو ژمارەی بچوکی پاڵەپەستۆی خوێن.
٢- زیادبوونێکی کەم لەژمارەی لێدانی دڵ «Mild tachycardia» کە دەگاتە نزیکەی «١٠٠» لێدان/دەقیقە.
٣- هێواش پڕ بوونەوەی مولوولە خوێنەکان «Slowed copillary refill».
٤- تەنها دوو دڵیەکی کەم «Mild anxiety».
٥- هێندی میزکردن لە «٣٠» مل/ کاتژمێر کەمتردەبێت.

**پۆلی ژمـارە سێ «Class III»:** «٣٠٪» تا «٤٠٪»ی خوێنی لەش وون دەبێت یاخود «١٥٠٠-٢٠٠٠» مل خوێن. ئەمەش هەر خۆی لەوەدا ئاشکرا دەکات کە: ١- دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی قەبارەی خوێن ئەنجامەکەشی دابەزینی پاڵەبەستۆی خوێنە. ٢- خێرابوونی لێدانی دڵ. زیاتر لە «١٢٠» لێدان/ دەقیقە. ٣- کەم بوونەوەی پاڵەپەستۆی لێدانی دڵ «Pulse pressure». ٤- ژمـارەی جـارەکـانی هەناسـەدان دەگـاتە «٣٠-٤٠» هەناسـە/ دەقیقە. ٥- دوودڵیی «Anxiaty» بەتایبەتی شێوانی نەخۆشەکە «Confusion». ٦- کەم بوونەوەی هێندی میزی دەرچوو لە لەشەوە.

**پۆلی ژمـارە چوار «Class IV»:** زیاتر لە ٤٠٪ی خوێن وون دەبێت. یاخود لەسەرووی «٢٠٠٠» مل دەبێت. ئەمەش ژیانی نەخۆشەکە دەخاتە مەترسیەوەو دەست بەجێ پێویست بە بووژانەوە «Resuscitation» دەکات. ئەم پۆلە دەبێتە هۆی دابەزینی پ.خ «پاڵەپەستۆی خوێن». ٢- خێرابوونی لێدانی دڵ زیاتر لە «١٤٠» لێدان/ دەقیقە هەروەها تێبینی خێرابوونی هەناسەدان دەکرێت. ٣- شێوانی باری دەروون «Confusion» و خەواڵو بوونی «Lethargy» نەخۆشەکە. ٤- هێندی میزکردن ئەوەند کەم دەبێتەوە تا ڕادەیەکی پشت گوێ خراو.

### چارەسەرکردنی خوێنبەربوون

١- قەرەبۆکردنی قەبارەی خوێنی کۆئەندامی سووڕان.
٢- بەخێرایی و بەلایەنی کەم دووکانیولا بۆ نەخۆشەکە چەسپ بکە. بەلایەنی کەم

پێوانەی دەرکەوانەی کانیولاکان «١٦» بێت.

٣- خوێن لەنەخۆشەکە وەربگرە بۆ زانینی جۆر «Group» و جووت بوونی «Cross match» لەگەڵ خوێنی خوێنبەخشەکەدا یاخود بۆ زانینی جۆرو پشکنینی خوێنەکە بەگوێرەی ماوەی پێویست و تینی پەلەکردن لەئیشەکەدا.

٤- گیراوەی رینگەر لاکتەیت بەهێندی «٣٠-٣٥» مل/کگم بدە بە نەخۆشەکە «٢ لتر بۆ کەسێکی پێگەیشتو کە تەمەنی مام ناوەندیی بێت» ئەمەش هێندێکی گەورەیە «Bolus» و پێویستیشە. واچاکە بۆ هەر «١٠٠» مل لەخوێنی وون بو «٣٠٠» مل لەشلەی کریستالیی بدرێ بە نەخۆشەکە.

٥- ئەگەر نەخۆشەکە دوای بەخشینی «٣-٤» لیتر خوێنی کریستالیی هێشتا هەر نەبووژێتەوە، پلازما لە رژێمەکەدا بەکاربهێنە.

شلەی کریستالیی لەپۆلی یەکەم و دووهەم لەجۆرەکانی خوێن بەربوون، قەبارەی خوێن دەگێرێتەوە-بۆ باری سروشتیی. کەچی پۆلی سێیەم و چوارەم پێویست بەخوێن دەکەن. هەروەها بۆ پۆلی چوارەم و کاتێک کە خوێن بەربوونەکە بەردەوام بێت و جۆری خوێنی نەخۆشەکەش «O-ve» بێت، پێویست بە پشکنینی جووت بوون ناکات.

٦- بۆ ڕاگرتنی خوێن بەربوونی دەرەوەی جەستەی نەخۆشەکە «External haemorrhage» ، پاڵەپەستۆی ڕاستەوخۆ بخەرە سەر ناوچەی خوێن بەربوونەکە. یاخود برینەکە بەتوندیی بپێچەوە کەچی نابێ تۆرنیکاو گیرە «Clamp» بەکاربهێنرێن. هەروەها چەسپ کردن و قەدەغە کردنی جووڵاندنەوەی هەر شکانێک، یارمەتی کەم بوونەوەی خوێن بەربوون دەدات.

٧- بەر لە گەیشتنی نەخۆشەکە بۆ نەخۆشخانە لەگەڵ نەخۆشخانەکانی جیهاندا بەرگی هەوایی دژی بوورانەوە «P.A.S.G» واتە «Pneumatic antishock gargment» بەکاردەهێنرێ. بەجۆرێک کاتێ کە پاڵەپەستۆی گوزەری خوێن سروشتیی بێت، بەرەبەرە «P.A.S.G» بەتاڵ دەکرێتەوە. لەسەرەتادا پارچەی ناوچەی سک بەتاڵ دەکرێتەوە ئنجا هەر لاقێک. ئەگەر هاتو تێبینی دابەزینی «پ.خ» بکرێت، بەتاڵ کردنەوەی هەوا ڕادەگیرێ و شلەی زیاتر دەدرێتە نەخۆشەکە.

٨- لێدانی دڵ لەناوچەی ملدا «Carotid pulse» لە «پ،خ»ی «٦٠» ملم. جیوە هەستی پێ دەکرێت. کەچی هەستپێکردنی لێدانی دڵ لەناوچەی مەچەکدا «Radial pulse» بەڵگەیە بۆ گەیشتنی «پ.خ» بە «٨٠» ملم. جیوە.

**«D» مەبەست «Disability» واتە پەک کەوتن:**

بریتیە لە پشکنینی کەم خایەنی کۆئەندامی دەمار «Brief neurologic examination» . ئاستی هۆشمەندیی نەخۆش بەرێگای «AVPU» بریاری لەسەر دەدرێت. بەم شێوەی خوارەوە:

A مەبەست «Alert» واتە هۆشمەند.
V مەبەست «Vocal stimuli» واتە توانای هەیە وەڵامی دەنگ بداتەوە؟
P مەبەست «Painfull» واتە توانای وەڵامدانەوەی وورووژاندنی ئازار بەخش.
U مـــەبەست «Unresponsive» واتە هیچ وەڵامێکی نەبێ. لەم کاتەدا پێویستە پشکنینی بیلبیلەی چاو «Pupil examination» بۆ نەخۆشەکە بکرێت بەمەبەستی زانینی قەبارەی بیلبیلەو وەڵامدانەوەی تیشکی رووناکیی.

**«E» مەبەست «Exposure» واتە چارەسەرکردنی باری گشتیی نەخۆشەکە:**
١- بەخشینی ئۆکسجین. ٢- چەسپ کردنی دووکانیولای گەورە. ٣- نەخشەی کارەبایی دڵ «ECG». ٤- تیوبی لووت بۆ گەدە چەسپ دەکرێت بەمەرجێک بنکەی لووت نەشکابێ «چونکە تیوبی لووت دەچێتە ناو چاڵی کەللەی سەرەوە». ٥- قەستەرەی میز بۆ نەخۆشەکە چەسپ دەکرێت بەمەرجێک ئەگەر هاتو بۆری میزهەڵنەزرابێ: ئەمەش بەهۆی ئەو نیشانانەی خوارەوە ئاشکرا دەبێت: أ- پەیدابوونی خوێن لەکۆتایی بۆری میز. ب- خوێن بەربوونی توورەکەی گون «Scrotal hemorrhage». جـ- هەست پێ نەکردنی پرۆستات دوای ئەنجامدانی پشکنینی کۆم بەپەنجەی دەست «P.R».
دواجار دەبێ پشکنینی گشتیی «Complete examination» ئەنجام بدرێت.

**پشکنینی دووهەمین «Secondary survey»:**
ئێمە ووتمان هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی کوتران «Trauma» چوارن: ١- پشکنینی سەرەتایی. ٢- بووژاندنەوە. ٣- دووهەمین پشکنین. ٤- گرنگی دانی کۆتایی.
کەواتە پشکنینی دووهەمین بریتیە لە هەنگاوی بەر لەکۆتایی و بەپەیرەوی کردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

١- پشکنینی سەر «Examination of the head».
٢- پشکنینی بەدیقەتی چاو کە بریتیە لە: أ- دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی بیلبیلەی چاوی نەخۆشەکە بۆ زانینی قەبارەو وەڵامدانەوەی تیشکی رووناکیی. ب- سەیری ناو قووڵایی چاو بکەو سەیری خوێن بەربوونی پێڵووی چاوو سەیری لاچوونی هاوێنەی چاو لەشوێن خۆی بکە.
٣- تێبینی شکانی شەویلاگ و رووی نەخۆشەکە یاخود شکانی کەللەی سەر بکە. برینی شەویلاگی خوارەوەو رووی نەخۆشەکە هەروەک شکانی بربڕەی مل چارەسەر دەکرێت، تاوەکو وێنەی تیشکی ئێکس بۆ هەر حەوت بربڕەکانی مل دەگیرێت.
٤- پشکنینی مل کە بریتیە لەشوێنەواری بۆری هەناسە، ئاوسانی پڕ لە خوێن «Haematoma» یاخود هەوا لەژێر پێستدا، باری خوێنهێنەرەکانی مل. هەروەها

تێبینی کردنی برینی کونبەدەر لەچەمکی ملدا. بەڵام نابێ برینەکە لەو کاتەدا واڵا بکرێتەوە.

٥- پشکنینی سنگ: جووڵانەوەی دیواری سنگ، جووڵانەوەی پێچەوانەیی لەگەڵ هەناسەداندا، شێوەکاری هەناسەدان، پشکنینی سنگ بەناو لەپی دەست «Palpation of the chest» بۆ زانینی باری پەراسوەکان و ئێسکی چەڵەمە و شکانی پەراسوەکان. هەروەها پشکنین بەهۆی بیستەکی پزیشکییەوە «Auscultation» بۆ هەڵزڕانی سییەکان و هەوا یاخود خوێن لە بۆشایی سنگدا.

٦- پشکنینی سک: ناسینەوەی برینی سک زەحمەتەو کەم وا ڕێ دەکەوێ کە ببێتە هۆی ئازارو خوێن بەربوونێکی ڕاقەنەکراو. ئازاری سک بەڵگەیەکی بەسە بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریی واڵاکردنی سک. هەروەها دەرکێشانی شلەی پریتۆن لەکاتی برینەکانی دەمار یاخود نەمانی هەست کردن. بەڵام دەرکێشانی شلەی پریتۆن نابێ بەر لە نەشتەرگەریی سک ئەنجام بدرێت. هەروەها تەنها دوای بەتاڵ بوونی میزڵدان ئەنجام دەدرێت.

٧- پشکنینی کۆم «Rectal examination»: بۆ زانینی بێ خەوشیی دیواری کۆم، شوێنەواری پرۆستات، هەبوونی خوێن.

٨- پشکنینی هەیکەلی نەخۆشەکە «Skeletal injury»: هەروەک داماڵین و تێک چوونی شێوەی ئەندامەکان و پشکنینی ئێسکە درێژەکانی ناوچەی حەوز ئەگەر نەخۆشەکە دوچاری شکانی ئێسک بیو، پێویستە داربەست «Splint»ی بۆ بکرێ. لەدواییشدا دەبێ وێنەی تیشکی ئێکسی بۆ بگیرێ.

٩- پشکنینێکی تەواوو زیاتر بۆ کۆئەندامی دەمار.

١٠- زانینی مێژووی ڕابردووی نەخۆشەکە «Past history» بەهۆی پەیرەوی کردنی ئەم پرۆتۆکۆلە: AMPLE Past history

A مەبەست «Allergies» واتە هەبوونی هەستیاریی «حەساسیە».

M مەبەست «Medications» واتە ئایا نەخۆشەکە چ دەرمانێک بەکاردەهێنێ.

P مەبەست «Past illness» واتە لەمەوبەر تووشی چ نەخۆشییەک بوە.

L مەبەست «Last meal» واتە دوا ژەمی خواردنی نەخۆشەکە چی بوە.

E مەبەست «Events» واتە ئەنجامەکان.

**تێبینی:** پێویستە پشکنینی سەرەتایی و پشکنینی دووهەمین کە هەنگاوی یەکەم و دوەمی بایەخدان بەکوتران «Trauma»ن لەماوەی نزیکەی «٢٠» دەقیقەدا ئەنجام بدرێن.

بایەخدانی کۆتایی بە کوترانی جەستە: بریتیە لە دوا هەنگاوی گرنگیدان بە نەخۆشەکە «Definitive care» ئەمەش مەبەستەکەی گرنگیدانە بەگشت برینەکانی نەخۆشەکە یاخود گواستنەوەی نەخۆشەکە بۆ شوێنێکی جێگیر.

# ناوەڕۆک

